د. نظام الدين عبد الحميد احمد

# وەلامدانەوەی چەند رەخنەیەك دەربارەی ئیسلام



ناوی کتێب: وەڵامدانەوەی چەند ڕەخنەیەک دەربارەی ئیسلام
نوسەر: نظام الدین عبدالحمید
بڵاوکردنەوەی: نوسینگەی تەفسیر بۆ بڵاوکردنەوەو ڕاگەیاندن هەولێر
خەت: نەوزاد کۆیی
بەرگ: أمین مخلص
نۆرە و ساڵی چاپ: یەکەم ١٤٢٨ک - ٢٠٠٧ز
تیراژ: ١٠٠٠ دانە

لە بەڕێوەبەرایەتی گشتی کتێبخانەکان ژمارەی سپاردنی (١٠٨١)ی ساڵی ٢٠٠٧ ی دراوەتێ

تەفسیر
بۆ بڵاوکردنەوە و ڕاگەیاندن
هەولێر- شەقامی دادگا - ژێر ئوتێلی شیرین پالاس
ت: ٢٢٢١٦٩٥ - ٢٢٣٠٩٠٨- ٢٥١٨١٣٨
مۆبایل: ٢٢ ٥١ ٦٠ ٤٦ ٠٧٥٠ - ٩١ ٧٢ ١٣٨ ٠٧٧٠
tafseeroffice@yahoo.com
tafseeroffice@maktoob.com
altafseer@hotmail.com

www.al-tafseer.com

# پێشەکی

سوپاس بۆ خودای بەرزی بێوێنە، کە ئەم کائیناتەی بە شێوەیەکی زۆر ڕێك و عەجایەب و سەر سورهێنەر هێناوەتەدی، کە ئادەمیزاد بەشێکە لە بەشەکانی، ئەم ئادەمیزادە، کە بیرو هۆش و تێگەیشتن و زوبانی پێبەخشیوە، تاوەکو کاروباری ژیانی خۆی لەم زەمینەدا بە باشی ڕێك بخات و شارستانیەتی تیا بێنێتەدی و ببێتە سەرۆك و بە نرخترینی هەمو گیان لە بەرەکانی دیکەی، کە تیای ئەژین.

سەلات و سەلاوی خودا لەسەر پێغەمبەرمان بێت، کە بەرزترین کەسە پێی بەسەر ئەم زەمینەیا کەوتبێت، بارانی ڕەحمەتی خوداش بە سەر یارەکانی و شوێنکەوتوەکانی تری بێت، تا زەمین ژیانی تیا ئەبرێت و دوارۆژ ڕو ئەدات.

خودای بەرزی بێوینە دواترین ئایینی و بەرزترین نیزام و قانونی خۆی بۆ پێغەمبەری نازدارمان ناردە خوارەوە (درودی خودای لەسەر بێت)، تا دواکەوتوەکانی بە دواکەوتنی شەرەفداربن.

یەکەمین میللەت کە روی کردبێتە ئەم ئایینە، دوای شوێنکەوتنی عەرەبەکان، میللەتی کوردە، کە بەو دواکەوتنەی لە دەست خراپەی ئێرانیەکان و بیروباوەڕی چەپەڵیان رزگاریان بوو، لە زەتی بیر راستی و سەرفرازیان چێشت.

میللەتی کورد بە درێژایی حوکمی ئیسلامی لە هەمو کاتێکیا خزمەت گوزاری ئایینەکەیان بوون، لە هەمو چەرخێکیا مرۆڤی زاناو دانای بەرزی تێدا هەڵکەوتوە، بە هەمو دڵێك و شەوقێك بونەتە ئەندام

بۆ بەرهەم هێنانی ئەو شارستانیەتەو ئەو حەزارەتە ئیسلامییە، کە چەند چەرخێك ئەگەشایەوەو روناکی بەهەمو لایێکی زەمین ئەگەیاند لەو کاتانەی، کە ولاتانی تر، بە تایبەتی ئەوروپا لە تاریکایی نەزانین و دواکەوتن ئەژیان و سەریان ئەهێناو سەریان ئەبرد.

دوژمنانی ئایینی ئیسلام لەم یەك دو چەرخەی رابردو، کە هەستیان بە بێهێزی بەڕێوەبەرانی مسوڵمانەکان کردو دیتیان ولاتەکانیان رو لە دواکەوتنە، هێرشیان هێنایە سەر ئەو ولاتانە، هەر لایەی بەشێك لەو دوژمنانە چنگی خۆی لێ گیر کرد.

بەشێکی مەرامی ئەوانە ئەوە بو، تا بۆیان بکرێت مسوڵمانەکان لە ئایینەکەیان دوربخەنەوەو، لەناو دڵیان بێهێزی بکەن، تا چۆن ئەیانەوێت ئەوها بیاندۆشن، چونکە ئەیانزانی ئەگەر ئایینەکەیان لەناو دڵیان بە هێزو بە جۆشبێت، بە سەرۆکایەتی بێگانە رازی نابن‌و ملیان بۆیان نانوێنن‌و بەرەنگاریان ئەبن‌و ژیانیان پێتاڵ ئەکەن. بۆ ئەمە پرۆگرامی خوێندنیان لە هەمو پلەیێکی خوێندنا وا دانا، کە زانینێکی ئایینی تێدا نەبێت، تا ئەوانەی تیا ئەخوێنن‌و تیا دەرئەچن شتێك لە فەرمانەکان‌و فەرمایشتەکانی ئایینەکەیان نەزانن‌و، بەینیان لە گەڵیا بپچڕێت‌و چرای ئیمان لە ناو دڵیانا روی لە کوژانەوە بێت، تا بتوانن لەو جێیانەی لەناو کۆمەلا ئەبنە خاوەن قسەو رێ نیشاندان‌و مامۆستایەتیان ئەکەوێتە ژێردەست، هەوڵدەن ئەو میللەتەی لە ناویانا ئەژین چ کورد بێت یان عەرەب بێت یان تورك، هەروەها هەر میللەتێکی تر لە ئایینەکەیان دوریان بخەنەوەو بەرەو بێبڕواییان بەرن.

میللەتی کورد بەشێکی لەو کەسانە کەوتە ناو کە ئەیانەوێت

پەردەیەکی ڕەش بخەنە بەینیان‌و بەینی ئایینەکەیان. هەر جاری یەکێك لەوانە ئەبینی چ بە زوبان بێت یان بە قەڵەم‌و نوسین، وەکو بە مانگە شەو وەڕیین ڕەخنە لە بڕیاردانێکی ئایینی ئیسلام ئەگرێت‌و بە شێواوی ئەیخاتە بە چاو لێی ئەدوێ، یان ڕەخنەکەی روی پێئەکاتە فەرمایشتێکی خودا یان فەرمایشتێکی پێغەمبەر ﷺ یان کردەوەیەکی بەبێ ئەوەی تێبگات‌و بزانێت ئەم قەڵایە بەهێزەی ئایینی ئیسلام چەکوشی لە تەنەکە دروستکراوی دەستی هیچ زیانێکی پێناگەێنێ‌و چەکوشەکەی بەرەو روی خۆی خوار ئەبێتەوەو ئازار بە دەموچاوی ئەگەێنێ، هەروەها بە بێ‌ئەوەی بیر بکاتەوەو بزانێت میللەتی کورد دوای ئەوەی روناکایی ئاینی ئیسلامیان پێگەیشت، بە هەمو ئارەزویەك‌و شەوقێکەوە رویان تێکردو مسوڵمان بون، مسوڵمانیەتی‌و بڕواو ئیمان تیا نە لە باوك‌و باوکانیانەوە بە میرات بۆیان بەرە خوار بۆتەوە، تا گەیشتۆتە ئەم چەرخە، بەرەو خوار بونەوەی ئەم میراتە لە ناو میللەتی کوردا هەر بەردەوام ئەبێت تا کۆتایی بە دانیشتوانی سەر ئەم زەمینەیا دێت‌و زەمینیش لە جێی خۆی ئەترازێت‌و تێك ئەچێت، ئنجا ئەوەی پێی ناخۆشە با سەری خۆی لە بەرد بدات.

بڕوا بە ئاینی ئیسلام لە ناو هەناوی زۆری زۆربەی میللەتی کورد رەگی دا کوتاوەو بە قوڵاییا چۆتە خوارەوەو بە شێوەیەك تیا گیر بوە کە هەڵقەندن و جیاکردنەوەی لە توانای ڕەخنەی گەندەڵی ڕەخنە لێگرتوان نیە[1]. شایەدێکیش ئەوەیە تۆ ئەگەر لە هەر رۆژێکی هەینیا لە

---

١) ئنجا ئەگەر چەند کەسێك لە هەر لایەکی کوردستان لە ئاینەکەیان وەرگەڕابن و بوبن بە دیان – هەر وەکو زانیومە – ئەوانە کەسانی پوچەڵن، رۆشنایی ئاینی ئیسلام لە یەکەم رۆژەوە لەبەر پوچەڵیان روی نەکردۆتە دڵیان‌و هیچ ئاگاداریەکیان بە سەر فەرمایشتەکانی ئاینی ئیسلام نەبوە، ئەوانە شەپۆلی بەهێزی پان‌و پۆڕی موسڵمانیەتی میللەتی کورد لێخن ناکەن‌و زیان بەرونیەکەی ناگەێنن.

شارەکانا روبکەیتە هەر مزگەوتێك لە مزگەوتەکان، ئەگەر نەختێك لە کاتی روتێکردنی دوابکەویت. لە ناویا جێت دەست کەوێت، ئەبێت لەبەر هەیوانەکەی دواتر لە حەوشەکەی شتێك بۆ خۆت دابخەیتو نوێژەکەتی لەسەر بەجێ بێنیت.

ئەو مێشك بە دوژمنایەتی ئایینی ئیسلام موتوربە کراوانە ئەگەر بیروباوەڕیان و لە ئاین هەڵ گەڕاوەکەیان هەر بۆ خۆیان بێت و لە ناو دڵیاندا بێت، بەبێ ئەوەی بیانەوێت ئەو بێ ئیمانیەو لە ئاین وەرگەڕاوەیان بڵاوبکەنەوەو خەڵکی کەی بە لاوە بەرنو رەخنە لە ئاین بگرن، ئەوە بەوەی لەسەرین کەیفی خۆیانە، چۆنیان ئەوێت با بڕوایان وابێت، خودای بەرزی بێوێنە لە قورئانی پیرۆزیا ئەفەرموێت (فمن شاء فليؤمن ومن شاء فليكفر...) واتە ئەوەی ئەیەوێت مسوڵمانبێت و ئیمان بێنێت کەیفی خۆیەتی، ئەوەیش ئەیەوێت بێبڕواو کافر بێت کەیفی خۆیەتی، لە دونیا هیچ بەرەنگارێك روی تێ ناکات، لە دوارۆژا هەر کەسە بە پێی بڕواو کردەوەی خۆی جەزا وەردەگرێت.

بەڵان ئەوانە ئەگەر بیانەوێ ئەو لارەشیەی هەیانە بە خەڵکی دیکە بگەیێننو هی دیکەی پێوە دوچار بکەن، بە قسەو وتار، یان بە نوسین رەخنەی پوچەڵیان روی پێبکەنە بیروباوەڕی مسوڵمانەکان، ئەوە کارێکە مرۆڤی مسوڵمانی ڕاستگۆی خوداپەرست بێزی لێ ئەبێتەوەو نەفرەتی لێ ئەکات.

ئەم شێوە کەسانە ئەبێت بەرامبەریان بوەسترێتو پوچەڵی رەخنەکانیان و ژەنگاوی بیروباوەڕەکانیان دەربخرێت تا کەسانی بیر کاڵو کەم زانا پێیان نەخەڵەتێن.

یەکێك لەوانەی کە خۆی بە مێژو زان ئەخاتە بەرچاو دکتۆر جەمال ڕەشید ئەحمەد ناو، لە لاپەڕەی (٣٩٨) تی بەرگی سێیەمی کتێبەکەی (ظهور الكرد في التاريخ) بە رو قایمی و بەبێ هیچ شەرمێك ئەڵێت: بۆ ئەوەی شورەو مەودای ئابوری لای بنەماڵەی (عەبد مناف) فرەوان بێت حەج بە جێ هێنان لای ئاینی ئیسلام بوە کارێکی بناغە قایم کە نەتەوەی عەبد مەناف مەبەستی بەم قسەیە پێغەمبەرە — درودی خوای لە سەر بێت - ئالآکەی بەرزکردەوە، لە وتارێکی وای دەرخست کە حەج کردن جەزاکەی هیچ نیە بەهەشت نەبێت.

ئنجا ئەی برای بەڕێز! تەماشای ئەم قسەیە بکە کە ئەڵێت پێغەمبەر حەجی بۆ بوژاندنەوەو ڕێکخستنی ئابوری تیرەکەی خۆی بە پێویست دانا، واتە حەج کردن لەوە پێش تر نەبوە پێغەمبەر بڕیاری لە سەردا بۆ قازانج بە بنەماڵەی (عەبد مەناف) گەیاند.

ئەم کابرایە ئەمە قسەیەتی بەبێ ئەوەی بیر بکاتەوەو تێ بفکرێ ئەو مێژوەی وا دائەنێت کە ئەو زانایەتیو ئەیزانێت بە درۆی ئەخاتەوەو چەپۆکێکی پیا ئەماڵێت، چونکە ئەوەی نەختێك ئاگاداری بەسەر مێژودا هەبێت بۆی دەرئەکەوێت و ئەزانێت کە حەج بەجێ هێنان لە کاتی جەنابی ئیبراهیم پێغەمبەر بە پێویست دانراوە.

خوای بەرزی بێوینە لە قورئانی پیرۆز لە ئایەتی (٢٧) لە سورەتی (حەج) بۆمان دەرئەخات کە ئەم پێویستیەی بە جەنابی ئیبراهیم گەیاندوە، کە ئەفەرموێت ﴿وَأَذِن فِي النَّاسِ بِالْحَجِّ يَأْتُوكَ رِجَالًا وَعَلَى كُلِّ ضَامِرٍ يَأْتِينَ مِن كُلِّ فَجٍّ عَمِيقٍ﴾ ئایەتەکە روی لە جەنابی ئیبراهیمە، چونکە لە ئایەتی پێش ئەم ئایەتە دەفەرموێت: ﴿وَإِذْ بَوَّأْنَا لِإِبْرَاهِيمَ

مَكَانَ الْبَيْتِ...﴾ لێرە بە ئیبراهیم دەفەرموێت: پێویستی هێنانەدی حەج بە خەڵك بگەیێنەو بانگی بۆ رایەڵ بکە.

ئنجا ئەبینی خەڵك لە هەمو لایەك‌و لە هەمو رێییێکی دورو نزیك بە پیادەو بە سواری حوشترو لە کەعبە ئەکەن‌و حەج بەجیٚ‌دێنن.

ئنجا لەو کاتەوە هۆزەکانی عەرەب هەموو ساڵێك لە مانگی حەجا رویان ئەکردە مەککەو حەجیان ئەکردو بە چاوێکی زۆر گەورە تەماشای کەعبەیان ئەکرد، ئەگەر یەکێك لەو جێگەیە باوك کوشتەی خۆی بدیتایە دەستی تۆڵەسەندنی بۆ درێژ نە ئەکرد.

ئەو عەرەبانە کە بۆ حەج ئەچون ئەبوایە جلێکی تازەیان لە بەر بوایە نەك جلێك کە گوناه کردنی لەگەڵ بوایە، ئەوەی نەی بوایە لە مەککە داوای لە یەکێك ئەکرد جلی خۆی بداتیٚ تا بەو جلەوە بە دەوری کەعبەوە بسورێتەوە، ئەوەی جلی بەدەست نەکەوتایە شەوان بە تاریکە شەو بە روتی ئەو سورانەوەی بەجیٚ ئەهێنا.

ئنجا ئایە بە چ زانینێك‌و هۆشێك‌و مێژو زانینێك ئەم کابرایە ئەو قسە بۆگەنەی خستۆتە سەر کاغەزو نوسیویەتی ئەگەر دوژمنایەتی لەگەڵ ئاینی ئیسلام نەبێت.

چشتێکی دیکە لەمە خراپتر لە لاپەڕەی (٤٠١) ی ئەو بەرگە لە کتێبەکەی قسەیەکی دیکەی بۆگەنی بەرامبەر پێغەمبەر کردوە ﷺ ئەوەی من بزانم تا ئێستاکە هیچ کەسێك لە دوژمنانی ئیسلام هەرچەندێك لە دوژمنایەتیەکەی تیژ بوبێت بیرو هۆشی خۆی لەوە بەقەدر تر گرتوە لەوەی رِێ بدات بێ‌نرخی روی تیٚ بکات‌و ئەو درۆو ئیفترا بەرامبەر پێغەمبەر بکات کە ئەو کابرایە روی تیٚ کردوەو

وتویەتی کە لەناو میللەتێك ئەژێتو پێیــەوەی نوســاوە کــە لــە ٩٥٪ مــسوڵمانەو بــە چــاوی حورمــەتو بــەرزو خۆشەویــستی تەماشــای پێغەمبەرەکەی ئەکات - سڵاوی خوای لەســەر بێــت - ئــەم ســەرەتایە جێی رەتکردنەوەی ئەو قسەیەی نیە چونکە درێژەپێدانی ئەوێتو ئەبێت بە سیپارەیەکی تایبــەتی بــە عــەرەبی بێتــە نوســینو بڵاوبکرێتــەوە — چونکە کتیبێکەی بــە عەرەبیــە — تــا دەرون کینــە داری ئــەو کابرایــە بەرامبەر ئەم ئاینەو ئــەو پێغەمبــەرەی کــە میللــەتی کــورد شــوێنی کەوتوەو ئاشکرا ببێتو دەر بخرێت.....

## حیکمـەت لە فـرەژنی پێغـەمبـەر ﷺ

باسێك لەو باسانەی لە ئایین هەڵ گەڕاوەکان ڕەخنەی لـێ ئـەگرن، ئەوەیە ئەڵێن پێغەمبەر مرۆڤێکی شـەهوانی بـوە، بۆیـە ئـەبینین لـە کاتێکدا چەند ئافرەتێکی لەژێر باڵا بوە، ئەمە لەگەڵ پێغەمبەرایـەتی چۆن ئەگونجێت؟ ئەگەر پێغەمبەر بوایە ئەبو یان هیچ ژنێکـی نـەبێت، یان لە ئافرەتێك پتری نەخستایەتە ژێر باڵی.

ئەم جۆرە کەسـانە کـە ئـەم قـسانە ئەکـەن ڕشـانەوەی هەنـدێك لـە موستەشریقەکان و دوژمـنانی ئاینی ئیسلام لەوانەی بە مرۆڤانی کە نیسە لەقەڵەم ئەدرێن ئەبجونو کاوێژی ئەکەن، کە بە گژ ئـاینی ئیـسلام چـونو پەلاری پوچەڵ لە پێغەمبەر ئەگرن .

ئەوانەی بەم ڕەخنەیە رو لە پێغـەمبەر ئەکەن لە ئاین وەرگەڕاوەکانو غەیرە ئاینەکانن کە بە دوژمـنایەتی رو لە ئاینی ئیسلامو پێغەمبـەری ئیسلام ئەکەن گێـلو نـەفامو دڵ ڕەشـن نـازانن مەبەسـتو مـەرامی پێغەمبەر چی بوە لە زۆر ژن هێنانی.

ئەگونجێت یەکێك لە وەڵامـی ئەم پرسیارو ڕەخنەیە بڵێت لەو کاتـەی کە پێغەمبـەری تیـا ژیـاوە ژن زۆر هێنـان بـاوبوەو عـورفو عـادەتی کۆمەڵایەتی بوەو نیشانەی ڕەسەنایەتیو خانـەدانی سـەرۆکایەتی بـوە، پێغەمبەر لـەم ڕووەوە ڕوی کردۆتـە عـورفو عـادەتی قەومەکـەی کـە یەکێك بوە لە هەرە خانەدانی ئەو قەومە.

پێغەمبەر جگە لـە پێغەمبەرایەتییەکـەی لـە مەدینـە سـەرۆکی ئەنجومـەنی ئیسلامـی بوە، سەرۆکەکان لە هەمو کاتێك وڵاتێك هەندێك

مافیان بۆ هەیە زیادو جیاواز لە مافی دانیشتوانی وڵاتەکانیانو هەندێك کاری جیاوازیان بۆ بڕیار ئەدرێت کە بۆ غەیری ئەوان نیە، ئنجا با ئەمە (فرە ژنی) کارێکی تایبەتی بێت لەو کارانەی کە بۆ سەرۆکەکان بڕیار ئەدرێت جگە لە عورفو عادەتی ئەو کاتە.

بەڵێ ئەشێت ئەم ڕەخنە پوچەڵە بەم وەڵامە پوچەڵیەکەی دەر بخرێتو جەوابی پێبدرێتەوە، بەڵام لەگەڵ ئەمەشا ئەڵێم ئەمە وەڵامی ڕاستو تەواو نیە، مەبەستو دوربینیو بەرزایەتی پێغەمبەر دەر ناخات چونکە پێغەمبەر ﷺ هەر ژنێکی مارە کردبێت لەبەر مەبەستێكو مەرامێكو حیکمەتێك بوەو دور بینی تیا هاتۆتە دی، نەك لەبەر ئارەزوی جنسیو شەهوەت، وەکو رو زەردەکان ئەڵێن، کە ڕەوشتی بەرزی پێغەمبەر بە درۆیان ئەخاتەوەو مێژو هەڵەکەیان ئاشکرا ئەکاتو بەردێك ئەپەستێتە دەمیانو وەڕینەکانیان پێ ئەبڕێت...

مێژو شایەدی ئەدات کە پێغەمبەر خاوەنی ڕەوشتێکی بەرز بوەو لە کاتی گەنجیا دور بوە لە ڕوکردنە ئەو کارە ناشرینانەی کە گەنجەکان رویان تێ ئەکرد. هیچ نەبیستراوە کە رۆژێك لە رۆژان روی کردبێتە ئەو جێگایانەی کە گەنجەکان لە دەوروپشتی شاری مەککە بۆ رابواردنی کەیفو سەفا ڕویان تێ ئەکرد، ئەو جێگایانە کە بەیداغی بەسەرەوەبو کە نیشانە بو بۆ رابورادن لەگەڵ دامێن پیسەکان .

پێغەمبەر سڵاوی خودای لەسەر بێت لە تەمەنی (٢٣) ساڵی خەدیجەی کچی خوەیلیدی مارە کرد کە ئافرەتێکی بێوەژن بو لە تەمەنی چل ساڵی دا بو، ماوەی (٢٨) ساڵ لەگەڵ ئەم ئافرەتە بەڕێزە

ژیانی بەسەر برد ، (١٧) ساڵ پێش ئەوەی بە پێغەمبەرایەتی شەرەف دار بکرێت (١١) ساڵیش دوای ئەم بەشەرەف دار کردنە.

پێغەمبەر ﷺ لەم ماوەیە بیری لەوە نەکردۆتەوە کە ژنێکی دیکە بێنێت، ئەگەر بیویستایە کام مرۆڤ لە هۆزەکەی خاوەنی ڕێزو توانا بو بە فەخرەوە کچی خۆی ئەدایو لێی مارە ئەکرد ، چونکە لەبەر ڕەوشتی بەرزیو جوانی بیرو هۆشیو دڵ پاکیو ئەمینی بە چاوێکی بەرز تەماشا ئەکرا ، جگە لەوە کە یەکێك بو لە خانەدانو ئەشرافی هۆزەکەی.

پێغەمبەر ﷺ لە ماوەی ئەو (٢٨) ساڵە بیری لە ژن هێنانێکی دیکە نەکرد ، چونکە مرۆڤێکی شەهوانی نەبو هەروەکو ناحەزان ئەڵێن پێغەمبەر دوای ئەوەی لە تەمەنی پەنجا ساڵی تێپەڕکرد کە مرۆڤ لە لایەن ئارەزوی ئافرەت ڕو لە کزی ئەکات، دوای ئەوەی خاتو خەدیجە سەری بردە ژێر خاك روی کردە ژن هێنان یەك لەدوای یەك کە هەمویان بێوەژن بون جگە لە خاتو عائیشەی کچی ئەبوبەکری صدیق، مارەکردنی ئەو ژنانە هەر یەکە لەبەر مەرامو مەبەستو حیکمەتێك بو هەروەکو یەك بە یەك ئەی خەینە بەرچاو:

١- پێغەمبەر سڵاوی خوای لەسەر بێت دوای مردنی خاتو خەدیجە بە ماوەیەکی کەم پێش ئەوەی لە مەککەوە بۆ مەدینە کۆچ بکات (سەودەی کچی زەمعەی) مارە کرد کە بێوەژنێکی لە تەمەندا بە ناو ساڵەوەچو بو کە پێشان خێزانی سەکرانی کوڕی عەمر بو ، کە کچی مامی خۆی بو ، کە پێشتر هەردوکیان مسوڵمان بون، بەڵام لە بەر ئازاردانی کافرانی مەککە کۆچیان کردە حەبەشە.

بەڵام پاشی ماوەیەك وا خرایە گوێیان کە کافرانی مەککە وازیان لە عەزیەتدانی مسوڵمانەکان هێناوە کە لە مەککەدا مابون، لەبەر ئەوە هەردوکیان گەڕانەوە مەککە، بەڵام بینیان کافرانی مەککە هەر لەسەر ڕەوشتی خۆیان ماونو بە هەمو شێوەیەك هەوڵ ئەدەن ئەوانەی مسوڵمان بون لە ئاینەکەیان وەریان بگێڕن بەڵام ئەمان گوێیان بە عەزیەتو ناخۆشی نەداو لەسەر بیروباوەڕو ئیمانیی خۆیان سورو ڕشت بون.

پاشی ماوەیەك سەودە مێردەکەی کۆچی دوایی دەکات، سەودە بە غەمبارێکی زۆرو بەبێکەسیو بە بێ ئیدارەیی بە تەنیا ئەمێنێتەوە بە بێئەوەی زەدەیەك بە ئیمانو بڕوای خۆی بگەیێنێت.

پێغەمبەر ﷺ تەماشای کرد ئەم ئافرەتە پیرە دڵ ڕوناکەی بێکەسە پێویستە پاداشت بدرێت بەرامبەر ئەو ئازارو ناخۆشیەی کە لە ڕێگای ئاینەکەی چێشتویەتی، دیتی باشترین پاداشتیش کە خۆشی پێ ببەخشێت ئەوەیە کە خۆی مارەی بکاتو شەرەفی دایکایەتی مسوڵمانەکانی بەسەرا بدات.

٢- پێغەمبەر ﷺ پێش هێنانی خاتو سەودە خاتو عائیشەی کچی ئەبوبەکری مارە کرد بو، بەڵام نەیگواستبۆوە تا کۆچی کردە مەدینە.

ئەبوبەکر خودا پلەی لە بەهەشت بەرز بکاتەوە، پێش هاتنی ئاینی ئیسلام برادەری پێغەمبەر بو، ئەگەر لە مرۆڤەکانە یەکەمین کەس نەبوبێت کە ئیمانی بە پێغەمبەرایەتی پێغەمبەر هێنابێ دوەمین کەس بوە لەو ڕۆژەوە هەمو توانایەکی خۆی بۆ سەرکەوتنی ئاینی ئیسلام تەرخان کردوەو لەسەر دەستی ئەو بەشێك لە مسوڵمانەکانی پێشو مسوڵمان بو بون، وەکو زوبێری کوڕی عەووامو عەبدولڕەحمانی

کوری عەوفو سەعدی کوری ئەبو وەققاصو تەڵحەی کوڕی عبداللهو چەند کەسانێکی دیکە، بە ماڵی خۆی چەند کۆیلەیەکی کڕیوە کە بەدەست بت پەرستەکانی مەککە ئازار ئەدرانو لە کۆیلایەتی ئازادی کردوون کە یەکێکیان بیلالی حەبەشی یە.

پێغەمبەر ﷺ فەرمویەتی: کەس نەبو لە وانەی داوای مسوڵمان بونم لێ کردبێ کە هەڵوەستەیەکی نەکردبێتو وەستانێکی نەبوبێت تەنیا ئەبوبەکر نەبێت، ئەم کە داوای مسوڵمان بونم لێکرد بەبێ تەگەرەو وەستان مسوڵمان بوو بە هەمو دڵێکەوە ئیمانی هێنا. پێغەمبەر کە ویستی بە نهێنیو بە بێئاگا لێبونی بت پەرستەکانی مەککەو سەرۆکەکانیان بۆ مەدینە کۆچ بکات ئەبوبەکر تفاقی کۆچ کردنی ڕێك خستو لە گەڵیا کۆچی کرد ئنجا مرۆڤێك ئەمە کردەوەو کۆششی بێت بەرامبەر ئاینەکەی ئایا جێی ئەوە نیە پێغەمبەر پاداشتی بداتەوەو بە خەزوری خۆی بگێڕێتو کچەکەی مارە بکاتو قەدرو حورمەتی بەسەرا بدات.

٢- دوای غەزای بەدر بە ماوەیەك پێغەمبەر ﷺ خاتو حەفصەی کچی عومەری کوڕی خەتتابی مارە کرد، کە مێردەکەی لەم غەزایەدا شەهید کرابو کە ناوی (خونەیسی کوڕی حوزافە) بو. حەفصە بە مردنی مێردەکەی زۆر دڵ تەنگو غەمگین بو بە شێوەیەك ئەم غەمەی روی کردە باوکیشی چونکە زۆری خۆش دەویست. پاش تەواوبونی عیددەی حەفصە باوکی داوای لە جەنابی ئەبوبەکر کرد کە مارەی بکات بەڵام ئەبوبەکر ئارەزوی نیشان نەدا، دوای ئەم

داواکردنە روی لە جـەنابی عوسمـان کـرد ئـەویش وەکـو ئەبوبـەکر ئارەزوی نیشان نەدا.

جەنابی عومەر کە لەم دو داواکردنە هیچی بۆ نەچوە سـەر زیـاتر عاجزو غەمبار بو، پێغەمبەر کە بەمەی زانی فـەرموی یـەکێك لـە عوسمان باشتر حەفصە مارە ئەکات (واتە خۆی) بۆ ئەوەی رێزو حورمەت بەرامبەر عومەر بنوێنێ، چونکە لەو رۆژەی کە ئەم ئیمـانی هێنـاوەو هاتە ریزی مسوڵمانەکان، بوژانەوە کەوتە ناویان توانیان بـە ئاشـکرا ئیمانی خۆیان دەربێننو بتوانن رو بکەنە کەعبەو نوێژی لـێبکەن.

ئەگەر ئەبوبەکر وەزیری دەستی راستی پێغەمبـەر بوبـێ عومـەر وەزیری دەستی چەپی بـوە چـونکە بـە هـەمو توانایـەکو شـێوەیەك هەوڵی بۆ بڵاوبونەوەی ئاینەکەی داوەو درێغـی لـە پـشتیوان گێـری مسوڵمانەکان نەکردوە.

پێغەمبەر ﷺ هەروەکو وتمان بۆ رێـزدان بـە عومـەر، حەفـصەی مارە کرد نەك لەبەر ئارەزو چونی بۆ حەفـصە، شـایەدیش لـە سـەر ئەمە ئەوەیە کە رۆژێـك خێزانـی جـەنابی عومـەر لەسـەر کارێـك نەختێك بە توندی لەگەڵی دوا، عومەر پێی وت ئێوە پـێش هـاتنی ئاینی ئیسلام نرخێکتان نەبوو بە کەمو سوکی تەماشا ئەکران، ئـەم ئاینە کە هات نرخی پێتان داو مافی بۆ بڕیـاردان، ئایـا ئەمـە وات لـێ ئەکات بەم شـێوەیە لـە گـەڵم بـدوێیت، ئـافرەت وتـی بۆنـا، کچەکەت حەفصە هەندێك جار بەرامبەر پێغەمبەر ئەوەسـتێت بـە شێوەیەك کە بە درێژایی ئەو رۆژە عاجز بێت، جـەنابی عومـەر کـە ئەمـەی بیست روی کردە ماڵی حەفصەو پێی وت بیستومە هەنـدێك

جار پێغەمبەر عاجز ئەکەی جارێکی دیکە ئەمەت لێ رو نەدات پێغەمبەر تۆی لەبەر خۆت مارە نەکردوە تۆی لەبەر دڵی من مارە کردوە، گەر نا تەڵاقت ئەدات.

٤- دوای غەزای ئوحود پێغەمبەر ﷺ زەینەبی کچی خوزەیمەی مارە کرد کە مێردەکەی لەم غەزایەدا شەهید کراو ئەم بە بێوەژنی و دڵ پڕ غەمی مایەوە. ئەم ئافرەتە ئافرەتێکی زۆر سەخیو خێر خوا بووەو زۆر زگی بە هەژارو لێقەوماوان ئەسوتاو بە پێی توانای دەستی یارمەتیانی بۆ درێژ ئەکردن لەبەر ئەمە پێی ئەوترا (ام المساکین) واتە دایکی هەژاران، پێغەمبەر ویستی لەبەر ئەم ڕەوشتە جوانانەی بە مارە کردنی باری ئەو لێقەوماویەی لەسەر هەڵگرێت و برینی دڵی تیمار بکات و غەمی تەنیاییو بێئیدارەیی لەسەر لابەرێت. ئەم ئافرەتە لە کاتی ژیانی پێغەمبەردا سەری بردە ژێر خاك.

٥- پێغەمبەر درودی ﷺ لە ساڵی چوارەمی کۆچی ئوم سەلەمەی مارە کرد کە ناوی هند، بو ئەم ئافرەتە هاوسەری ئەبو سەلەمە بو کە کوری پوری پێغەمبەر بوو برای شیریشی بو کە لە کاتی خۆی ثەوبیە ناوێك شیری دابوە هەردوکیان. ئەبو سەلەمە لە غەزای ئوحود بریندار کراو بەو برینەوە وەفاتی کرد. ئەم لە کاتی خۆی لەگەڵ هاوسەرەکەی لە مەککە بە دەست بت پەرستەکان گەلێك عەزیەت و ناخۆشیان دیت، لەبەر ئەمە کۆچیان کردە حەبەشە، دوای ماوەیەك گەڕانەوە، بەڵام دیتیان ژیانیان ناخۆشە، لەبەر ئەوە بڕیاریان دا بەرەو مەدینە کۆچ بکەن، بەڵام کەس‌وکاری ئوم سەلەمە نەیان هێشت لەگەڵ ئەبو سەلەمە کۆچ بکات، ئەبو سەلەمە بە تەنیا کۆچی کرد،

پاشتر کە ئوم سەلەمە هەلی بۆ ڕێککەوت ئەویش کۆچی کردو لەگەڵ ئەبو سەلەمە یەکی گرت کە زۆری خۆش دەویست.

ئەم ئافرەتە بەساڵەوە چوە بە مردنی مێردەکەی زۆر دڵتەنگ‌و غەمبار بو چونکە بە بێئیدارە بە چەند منداڵێکەوە بە تەنیا مایەوە. کە ماوەی عیددەی تەواو بو جەنابی ئەبوبەکرو جەنابی عومەر هەر یەکەی لە دوای یەك داوای مارە لێکردنیان لێکرد، بەڵام ئەو ڕای بۆ کەسیان نەنواند.

پێغەمبەر ﷺ کە دیتی ئەو ئافرەتە دڵ تەنگ‌و پر غەم و ئازارە بە چەند منداڵێك بە بێ ئیدارەو بە بێخزم‌و کەس ماوەتەوە، ویستی بەرامبەر ئەو هەمو عەزیەت و ناخۆشیەی کە لە ڕێی بڕواو ئاینەکەی چێشتویەتی‌و بەرامبەر ئەوهەمو ناخۆشیە کە دوای مێردەکەی روی تێکردوە خۆشی بخاتە دڵی‌و غەمی لەسەر لابەرێت، داوای مارەکردنی لێکرد ئافرەت دەری خست کە پیرەو خاوەنی چەند منداڵێکە، پێغەمبەر ﷺ بۆی دەرخست کە لەبەرئەمە ئەیەوێ مارەی بکات تا ئاگاداری منداڵەکانی بکات کە مامی شیریانەو منداڵانی کوڕی پوریەتی، ئنجا بەم‌مارەکردنەوە بووە خێزانی پێغەمبەر، بوە یەکێك لە دایکانی مسوڵمانەکان‌و خۆشی‌و شادی روی کردە دەرونی. ئەم ئافرەتە لەسەر بردنە ژێر خاك دواترین خێزانەکانی پێغەمبەرە کە لە ساڵی (٦٣) کۆچیدا مردن روی تێکردوە.

٦- دوای مارەکردنی خاتو ئوم سەلەمە بەچەند مانگێك پێغەمبەر ﷺ خاتو زەینەبی کچی جەحشی مارەکرد کە کچی خاتو ئومەیمەی کچی عەبدولمتەلیب بو واتە کچی پوری خۆی. ئەم ئافرەتە هاوسەری زەید،

کوڕی حاریسەی کەلبی بو، کە پێش هاتنی ئاینی ئیسلام کۆیلەی پێغەمبەر بو، بەڵام ئازادی کردبو بە کوڕی خۆی گیرا بو بە پێی عورف‌و عادەتی ئەوکاتەی پێش هاتنی ئاینی ئیسلام‌و پێغەمبەرایەتی پێغەمبەر، بۆیە پێی ئەوترا زەیدی کوڕی محمد، پێغەمبەر زۆری خۆش ئەویست، ئەویش پێغەمبەری لە باوك‌و لە هەمو کەسەکانی تری زیاتر خۆش ئەویست، کە ئایینی ئیسلام هات زۆر زو بە هەمو دڵێکەوە مسوڵمان بو.

پێغەمبەر دوای هاتنی ئاینی ئیسلام داخوازی زەینەبی لە براکەی کرد بۆ زەید، بەڵام نە ئەم‌و نە زەینەبیش بەمە قایل نەبون چونکە بە پێی عورف‌و عادەتی جاهیلی پێیان عەیب بو کچی خانەدان شو بە یەکێك بکات کە پێشان مۆری کۆیلایەتی بەسەرەوە بو بێت، بەڵام کە فەرمانی خودا لە ئایەتی (٣٦) لە سورەتی ئەحزاب هات کە ئەفەرموێت: ﴿وَمَا كَانَ لِمُؤْمِنٍ وَلَا مُؤْمِنَةٍ إِذَا قَضَى اللهُ وَرَسُولُهُ أَمْرًا أَن يَكُونَ لَهُمُ الْخِيَرَةُ مِنْ أَمْرِهِمْ....[1]) زەینەب‌و براکەی ڕەزامەندیان نیشانداو زەید زەینەبی مارە کرد، بەڵام هاوسەرایەتی لە بەینیان بە خۆشی‌و جوانی نەچوە سەر، چونکە زەینەب خۆی لە زەید بە زۆرتر دەزانی‌و بە توندی لە گەڵی ئەجولایەوە بۆیە ژیان لە بەینیان تاڵو تفت بو، لەبەر ئەمە زەید زەینەبی تەلاق دا، ئنجاکە عیددەی تەواو بو پێغەمبەر خۆی زەینەبی مارەکرد، نا بەڵکو خودا لێی مارە کرد.

---

١) واتە هیچ مرۆڤێك و ئافرەتێکی موسڵمان بۆی نیە خۆی لادات لە بڕیاردانێکی خوداو بە جێی نەهێنێ.

ئایە مەبەست لەم مارە کردنەی پێغەمبەر چی بو؟ کاڵ فامانو دوژمنانی ئایینی ئیسلام و لە ئاین وەرگەڕاوەکان ئەڵێن پێغەمبەر حەزی لە زەینەب کردو خۆشەویستەکەی دڵی داگیر کرد. ئەوانەی ئەم قسەیە ئەکەن – هەر کەسێك بن – نەختێك نرخی هۆشی خۆیان بزانیایەو بزانن ئەم ناماقولییەیان نەدەکرد، چونکە هەروەکو زانیمان زەینەب کچی پوری پێغەمبەر بو. لە منداڵییەوە تا گەیشتە شۆخی گەنجایەتی هەمو کاتێك پێغەمبەر دەیدیتو لە بەرچاوی بو ئەگەر حەزی لێبکردایەودڵی پێوە بەند بوایە بۆ خۆی داوای ئەکردو مارەی ئەکرد، نەك بۆ زەید کە بە کوڕی خۆی لە قەڵەم ئەدرا.

ئەم مارە کردنەی پێغەمبەر لەبەر مەبەستێکی بەرزی ئاینی بو، کەوا بە کورتی ئەیخەمە بەرچاو. هەروەکو زانیمان بە پێی عورفو عادەتی ئەوکاتە زەید بە کوڕی پێغەمبەر ئەناسرا چونکە خۆی بە کوڕی خۆی گیرابو، هەر مرۆڤێك کوڕێکی بە کوڕی خۆی بگێڕایە ئەو کوڕە هەمو مافێکی کوڕی ڕاستەقینەی بەسەرا ئەبڕاو بۆی بڕیار ئەدرا، هەروەها بۆ ئەو کەسەش کە خۆی بە باوك دائەنا، وەکو میرات لە یەك گرتنو حەرامبونی مارەکردنی کچی یەکترو خوشکی یەکتر هەروەها حەرامبونی مارکردنی ژنی یەکتر دوای جیابونەوە ئەگەر یەکێکیان ژنی خۆی تەڵاقی بدایە یان بە مردن لە دوای خۆی بە جێی بهێشتایە.

ئنجا کە خودا ویستی ئەم عورفو عادەتە جاهیلیە لابەرێتو یاسای کوڕی یەکێك بە کوڕی یەکێکی دیکە بڕیاردانو زانین لە ناو کۆمەڵا بن بڕ بکات، ویستی ئەمە هەر بە فەرمانی نەبێت، بەڵکو بە شێوەیەکی هێنانەدی بێتو بێنەدی، چونکە ئەوعادەتە عادەتێك

بو ڕەگی لەناو کۆمەڵا داکوتابو، بۆیە وای بڕیاردا کە ئەمە لە ڕێگای پێغەمبەرەوە دەربخرێت‌و بڕیاری لە سەر بدرێت تا ئەو پێشڕەو بێت بۆ روخاندنی ئەو عادەتە، بە فەرمان پێدانی زەینەب مارکردن کە تەڵاق دراوی زەید بو، تا دەرکەوێت زەید کوڕی محمد نیەو کوڕی بارکی خۆیەتی‌و زەینەب تەڵاقدراوی کوڕی نیەو (تەبەننی) عادەتێکی غەڵەت‌و بێ‌بناغەیە.

ئنجا ئەبینین خودا لەم روەوە لە ئایەتی چوارەمی سورەتی احزاب ئەفەرموێت: ﴿وَمَا جَعَلَ أَدْعِيَاءكُمْ أَبْنَاءكُمْ ذَلِكُمْ قَوْلُكُم بِأَفْوَاهِكُمْ وَاللَّهُ يَقُولُ الْحَقَّ وَهُوَ يَهْدِي السَّبِيلَ﴾[1] لە ئایەتی پێنجی ئەم سورەتەشا ئەفەرموێت: ﴿ادْعُوهُمْ لِآبَائِهِمْ هُوَ أَقْسَطُ عِندَ اللَّهِ فَإِن لَّمْ تَعْلَمُوا آبَاءهُمْ فَإِخْوَانُكُمْ فِي الدِّينِ﴾[2] هەر لەم سورەتە لە ئایەتی سی‌و حەوتەمی ئەفەرموێت: ﴿قَضَى زَيْدٌ مِّنْهَا وَطَرًا زَوَّجْنَاكَهَا لِكَيْ لَا يَكُونَ عَلَى الْمُؤْمِنِينَ حَرَجٌ فِي أَزْوَاجِ أَدْعِيَائِهِمْ إِذَا قَضَوْا مِنْهُنَّ وَطَرًا وَكَانَ أَمْرُ اللَّهِ مَفْعُولًا﴾[3].

---

١) واتە ئەوانەی ئێوە بە کوڕی خۆتانی دادەنێن — بە پێی عادەتی تەبەننی خودا بە کوڕی ئێوەی نەگێڕاوە ئەوە هەر قسەی دەمی خۆتانەو ئەساسێکی نیەو کوڕی ئێوە نین کوڕی بارکی خۆیانن. خودا چی حەقە راستە ئەوەتان بۆ دەرئەخات و ڕێی راست و تەواو نیشانی بەندەکانی خۆی ئەدات.

٢) واتە ئەوانەی بەناو بە کوڕی خۆتان گێڕاوەو وە بەناوی ئێوە بانگیان ئەکرێت ئەبێت بە ناوی بارکی خۆیان ناویان ببردرێت نەك بە ناوی ئێوە، ئەوە راست‌و ڕێکترو تەواوترە لە لای خودا. ئەگەر هات بارکیانتان نەزانی و نەناسی ئەوە ئەوانە برای دینیتانن ئەبێت بەو چاوە تەماشایان بکەن.

٣) واتە: کە زەید کاری لەگەڵ زەینەب تەواو بور تەڵاقی داو لە یەکتری جیابونەوە، ئێمە — ئەی محمد— زەینەبمان لە تۆ مارەکرد تا لە لای موسڵمانەکان گرنگ و عەیب نەبێت و دروست بێت هاوسەری ئەو کەسانە مارە بکەن کە هەر بە قسە بە کوڕی خۆتان بڕیارتان داون، ئەگەر هاوسەرەکانیان تەلاق داو لە یەکتری جیابونەوە یان مردن‌و لە دوای خۆیان بە جێیان هێشتن، چونکە ئەو شێوە ئافرەتانە هاوسەری کوڕی ئێوە نین بەڵکو کوڕی باوکی خۆیانن. فەرمانی خودا تەواوە دێتە دی.

ئنجا بۆمان دەردەکەوێت، کە مارەکردنی زەینەب لە لایەن پێغەمبەرەوە ﷺ بە فەرمانی خودا بوە خودا خۆی لێی مارە کردوە، بۆ لابردنو بنبڕکردنی عورفو عادەتی (تەبەننی) منداڵی یەکێك بە منداڵی خۆ دانان، نەك لەبەر ئەوەی حەزی لێکرد بو، هەروەکو کاڵ فامو نەفامەکان ئەڵێن.

من ئەم باسەم بە درێژی بە عەرەبی لە کتێبی (دراسات في العقيدة والتفسير والفقه المقارن) بە عینوانی من فقه قوله تعالى: ﴿وَتُخْفِي فِي نَفْسِكَ مَا اللَّهُ مُبْدِيهِ﴾ نوسیوەو رام لە فەرماندانی خودا، کە ئەبێت زەینەب یەکەم جار شو بە زەید بکات چی بو دەرم خستوە. هەر کەسێك بیەوێت ئەم باسەی بە باشیو بە درێژی بۆ رون ببێتەوە با لەو کتێبە تەماشای ئەو جێیە بکات.

٧ - پێغەمبەر ﷺ پێش ئەوەی سالّی شەشەمی کۆچی تەواو بێت بە ماوەیەکی کەم (جۆرییەی) کچی حارسی مارە کرد کە سەرۆکی هۆزی بەنولمستەلیق بو کە لایەك بو لە هۆزی خوزاعە.

ئەم هۆزە بە نهێنی ویستیان بەسەر مەدینەدا بدەن، پێغەمبەر کە بەمەی زانی بڕیاری دا کە ئەمان دەست لەوان بوەشێنن، ئنجا لەگەڵ بەشێك لە یارەکانی بەرەو هۆزەکە رۆیشتن بەرەنگاریان بون، پاش شەڕێکی کەم بە سەریان سەرکەوتنو بەشێکیان لێیان بە دیل گرت، کە جۆریە یەکێك بو لەو دیلانە.

ئنجا مسوڵمانەکان کە بە دیلەکانیان گەڕانەوەو گەیشتنەوە مەدینە جۆریە خۆی گەیاندە ماڵی خاتو عائیشە، لەوێ بەسەر هاتو غەمباری خۆی عەرزی پێغەمبەری کردو داوای یارمەتیدانی کرد.

پێغەمبەر ﷺ بە حیکمەت‌و دوربینی خۆی تەماشای داواکردنی ئەو ئافرەتەی کردو بڕیاریدا دیلایەتی لەسەر لابەرێت‌و مارەی بکات، ئنجا کە مارەی کردو مسوڵمانەکان ئەمەیان زانی، لەبەر قەدەر گرتنی ئەم مارەکردنەی پێغەمبەرو خزمایەتی بەستنی لەگەڵ سەرۆکی هۆزەکە، هەمو دەستیان لەسەر ئەو دیلانەی گرتبویان بەرداو ئازادیان کردن.

هۆزەکە کە بەمەیان زانی هەمو لەگەڵ سەرۆکەکەیان مسوڵمان بون، لەم روەوە خاتو عائیشە وتویەتی هیچ ئافرەتێکم نەدیوە لە جۆریە زیاتر کە بوبێتە گەورەترین خێرو بەرەکەت بۆ قەومەکەی ئنجا بزانە دوربینی پێغەمبەر لەم مارەکردنە چەند بەرزو پڕ حیکمەت بوە.

٨- پاش سەرکەوتنی مسوڵمانەکان لە غەزای خەیبەر پێغەمبەر ﷺ صفیەی کچی حویەی مارەکرد کە لەناو هۆزی (بنو النضير) بو کە لە کاتی خۆی کوژرا لەگەڵ ئەوانەی لەم هۆزە کوژران. مێردی دوەمی ئەم ئافرەتە کە نانەی ئیبن رەبیع بو لەم غەزایەدا کوژرا.

ئەم ئافرەتە لەم غەزایەدا بە دیل کەوتە دەستی (دیحیەی کەلبی) چەند کەسێك لە یارەکانی پێغەمبەر بە پێغەمبەریان وت ئەم ئافرەتە لە خانەدانی هۆزی بەنی قوریظە و هۆزی بەنی النضير، بۆ تۆ نەبێت بۆ کەسێکی دیکە دەست نادات، پێغەمبەر کە تەماشای دڵ پڕ غەمی‌و پەشۆکاوی‌و لێقەوماوی ئەم ئافرەتەی کرد بڕیاریدا کەرەمی خۆی پێ ببەخشێ‌و خۆی دەستی بخاتە سەرو لەو دیلایەتیە رزگاری بکات‌و مارەی بکات، ئنجا بەرگێکی خۆی بە سەریادا کە شایەدبێت لەسەر مارەکردنی، بەمە ئەم ئافرەتەی لەو غەم‌و ناخۆشیەی

كە تیایا بو قوتار كرد وە خزمایەتیەكی لەگەڵ جولەكەكان بەست تا شتێك لەو دوژمنایەتیەی لەسەرین سوكی بكات.

ئەم ئافرەتە بە هەمو ئارەزویەكییەوە مسوڵمان بو و خۆشەویستی پێغەمبەر دڵی داگیركرد، ڕۆژێك خاتو حەفصەو خاتو عائیشە ئەڵێن: ئێمە لە لای پێغەمبەر لە صەفیە لەبەرچاو ترو بە نرخترین، صەفیە ئەمە بە پێغەمبەر ئەگەیێنێ پێغەمبەر پێی ئەفەرموێت: نەئەبو بتگوتایە چون ئێوە لە من بە نرخترن، من خێزانی پێغەمبەرمو هارون پێغەمبەر باوكمە وە موسا پێغەمبەر ماممە، صەفیە لە نەتەوەی هارونە ئەمە لەناو قەومەكە دیاری‌و بڵاوە.

٩- پێغەمبەر هەر لەم ساڵەدا دوای مارەكردنی خاتو (صەفیە ئوم حەبیبە)ی كچی ئەبو سوفیانی مارەكرد كە لەكاتی خۆی لەگەڵ مێردەكەی عەبدوڵلای كوڕی جەحش مسوڵمان بون‌و هەردوكیان لە بەر ناخۆشیان بەدەست بت پەرستەكان لە مەككە كۆچیان كردە حەبەشە لەوێ مانەوە تا دوای ساڵی كۆچی، مێردەكەی دوای ئەوەی حەبیبەی لێ بو لە ئاین وەرگەڕاو بو بەدیان بەڵام ئوم حەبیبە لە سەر ئاینی خۆی مایەوەو لێی جیا بوەوەو بە ناخۆشی‌و دڵ پڕ غەمی بە تەنیا مایەوەو نەی ئەتوانی بگەڕێتەوە مەككە، چونكە ئەیزانی ئەبو سوفیانی باوكی بە خورتی لە ئاینەكەی وەری ئەگەڕێ و روی پێ ئەكاتە بت پەرستن.

پێغەمبەر كە بەمەی زانی بڕیاری دا مارەی بكات‌و خۆشی بخاتە دڵی، ئنجا كاغەزێكی بۆ نەجاشی نوسی كە ئەیەوێت ئوم حەبیبە مارە بكات ئنجا كە كۆیلەیەكی قەصری نەجاشی ئەو مژدەیەی بە

ئوم حەبیبە گەیاند، ئەگەر بلوایە لە خۆشیا ئەفڕی، ئەو دو بازنەی لە دەستی بو دای ماڵی‌و لە خۆشیا دایە ئەو کۆیلەیە، دوایی یەکێکی لە مسوڵمانەکان کردە وەکیل تا لە پێغەمبەری مارە بکات.

ئەم مارەکردنە لە قەصری نەجاشی هاتەدی، نەجاشی بەم مناسەبەیە لە قەصرەکەی دەعوەتێکی بۆ ئەو مسوڵمانانە کە کۆچیان کردبوە حەبەشە رازاندەوە، دوایی پێغەمبەر ﷺ، کەشتییێکی ناردە حەبەشە ئوم حەبیبەو مسوڵمانەکان هەمو بۆ مەدینە گەڕانەوە ئوم حەبیبە کە ناوی رەملە بو بوە دایکێك لە دایکانی مسوڵمانان.

رۆژێك ئەبو سوفیانی باوکی کە لەبەر کارێك دەچێتە مەدینە، لەوێ رو ئەکاتە ماڵی ئوم حەبیبەی کچی کە ئەیەوێت لەسەر جێگاکەی پێغەمبەر دابنیشێت، کچەکەی جێگاکە لول دەکات تا لە سەری دانەنیشێت، باوکی پێی ئەڵێت بۆ چ جێگایەکەت لولت کرد کچە پێی وت ئەمە جێگای پێغەمبەرە تۆ پیاوێکی بت پەرستی، نابێت لەسەر ئەم جێگایە دابنیشیت.

ئەوا دیتمان پێغەمبەر ئەو ئافرەتەی لەبەر سوربونی لەسەر بڕواو ئیمانی خۆی لەو غەریبییەی کە لە مێردەکەی جیا بۆوە بە بێکەس‌و بە بێ ئیدارە مایەوە مارەکرد، نەك لەبەر زۆر حەز لە ژن هێنان هەروەکو دڵ رەشە پڕ کینەکان ئەڵێن.

١٠- لە ساڵی حەوتەمی کۆچی کە پێغەمبەر بۆ عومرە بە جێهێنان چوە مەککە، مەیمونەی کچی حاریسی مارە کرد کە خوشکی خێزانی جەنابی عەباسی مامی بوو پوری خالدی کوڕی وەلید بو، ئەمیش

وەکو خێزانەکانی تری پێغەمبەر ﷺ بێوەژن بو، بەڵام پێغەمبەر دوای مارە کردنی ناوی بە مەیمونە گۆڕی.

ئەم ئافرەتە کە چاوی بە مسوڵمانەکان کەوت کە چۆن عومرە ئەکەن خۆشیو گەشی روی تێکرد ئارەزوی مسوڵمان بونی کردو دڵی بە پێغەمبەرەوە بەند بوو ئەمەی لای خوشکی درکاندو ئەمیش ئەوەی بە جەنابی عەباسی مێردی وت، عەباسیش ئەمەی بە پێغەمبەر گەیاند. پێغەمبەر کە ئەمەی بیست بینی پێویستە لەبەر عەباسی مامیو لەبەر خالیدی کوڕی وەلید ئارەزوی ئەم ئافرەتە بەجێ بێنیو مارەی بکات، جگە لەوەی کە دیتی ئەبێت نرخ بداتە ئەو ئافرەتەو مسوڵمان بونی.

ئەم ئافرەتە دواترین خێزانەکانی پێغەمبەر بو، دوای ئەم ژنی دیکەی مارە نەکرد، چونکە خودا لە ئایەتی پەنجاو دو لە سورەتی (الأحزاب) پێی فەرموو: ﴿لَا يَحِلُّ لَكَ النِّسَاء مِن بَعْدُ وَلَا أَن تَبَدَّلَ بِهِنَّ مِنْ أَزْوَاجٍ وَلَوْ أَعْجَبَكَ حُسْنُهُنَّ ...﴾، واتە: لەمەو بەدوا ژن هێنانی دیکەت بۆ دروست نیە، هەروەها دروست نیە دەست لە چەند هاوسەرێکت بەردەیتو ئافرەتی دیکە بێنیتە جێیان هەر چەندێك جوانیانت بە دڵ بێ.

(جان بروا) کە موستەشریقێکی گەورەی فرنسیە لە لاپەڕەی (١٠١)ی کتێبەکەی (محمد ناپلیۆن السماء) ئەڵێت: ئەوانە چەند نا تێگەیشتوێکن کە بیر ناکەنەوە لە فرە ژنی پێغەمبەر، کە هەر ژنێکی لەبەر حیکمەتێکی بەرز بوە دوای ئەوەی پەنجا ساڵی ژیانیان تێپەڕ کرد. مەبەستێك لە مەبەستەکانی مارەکردنی مەیمونە کە

پوری خالیدی کوڕی وەلید بو ئیسلام بونی خالید بو کە لە شەڕا ئەفسەرێکی ڕەشیدو تواناداڕو خاوەن پلان بو.

لە نزیکی ئەو کاتە واتە لە ساڵی هەشتەمی کۆچی خودا ڕاددەی بۆ فرە ژنی دانا، کە لە یەك کاتدا دەست بەسەر چوار زیاتر گرتن دروست نیە، ئنجا پێغەمبەر فەرمانی دایە ئەو یارانەی کە لە چوار ژن زیاتریان لایە ئەبێت دەست لەسەر ئەو زیادەیە هەڵ بگرن. پێغەمبەر خۆی لەوکاتەدا دەستی بەسەر نۆ ژنەوە بو کە لەوە پێش زانیمان هەمویان بێوەژنو پیر بون، جگە لە خاتو عائیشە بەلام دەستی لەسەر کەسیان هەڵنەگرت، چونکە ئەو ڕاددە دانە ئەوی نەئەگرتەوە، چونکە هەروەکو زانیمان پێغەمبەر هەر ژنێکی لەبەر مەبەستێك و حیکمەتێك مارە کرد بو، دەست بەردان لەسەر هەر کامێکیان نە ئەگونجا لەگەڵ ئەو مەبەستو مەرام و حیکمەتەو هەڵیانی ئەوەشاندەوە.

ئەمە لە لایەك لە لایەکی دیکەوە ئەگەر پێغەمبەر دەستی لە سەر هەر کامێکیان هەڵبگرتایە ئەوە بە بێ ئیدارەو گوزەران ئەمایەوەو کەس بۆی نەبو دەستی مارەکردنی بۆ درێژ بکات، چونکە خودا خێزانەکانی پێغەمبەری بە دایکی مسوڵمانەکان بڕیار دابو هەروەکو لە ئایەتی شەشەمی سورەتی (الأحزاب) ئەفەرموێت: ﴿النَّبِيُّ أَوْلَى بِالْمُؤْمِنِينَ مِنْ أَنفُسِهِمْ وَأَزْوَاجُهُ أُمَّهَاتُهُمْ﴾[1].

---

١) واتە: پێغەمبەر لە دوای موسڵمانەکان ئەبێت لە خۆیان نزیك ترو خۆشەویست تر بێت. خێزانەکانی لە مەعنادا دایکی موسڵمانەکانن، ئەبێت بەر چاوە تەماشا بکرێن و لەگەڵیانە بجوڵێنەوە.

هەر لەم سورەتەدا لە ئایەتی پەنجاو سێ ئەفەرموێت: ﴿وَمَا كَانَ لَكُمْ أَن تُؤْذُوا رَسُولَ اللَّهِ وَلَا أَن تَنكِحُوا أَزْوَاجَهُ مِن بَعْدِهِ أَبَدًا﴾[1].

دەربارەی ئەم باسە هەر کەسێك ئەیەوێت با تەماشای ئەم کتێبانە بکات :

١) (حياة محمد) بە قەڵەمی حوسێن هەیکەل .

٢) (نساء النبّي) بە قەڵەمی عائیشە بنت شاطيء

٣) (تاريخ الأمم الاسلامية) بە قەڵەمی خوضەری

٤) (محمد ناپليون السماء) بە قەڵەمی مستشریقی فرنسی جان برۆ.

٥) (محمد رسول الله) بە قەڵەمی زانیاری فەرنسی لات بین دینییەو سولێمان ئیبراهیمی جزائیری.

١) واتە: هیچ کاتێك نابێتو بۆتان نیە ئازار بە پێغەمبەر بگەیەننو عاجزی بکەن، هەروەها نابێتو ناکرێت دوای خۆی رو بکەنە هاوسەرەکانیانو مارەیان بکەن، چونکە ئەو هاوسەرانە بە دایکی خۆتان بڕیار دراون.

# له ژنێك زیاتر هێنان

ڕەخنەیەكی دیكە لەو ڕەخنانەی كە ئایین وەرگەڕاوەكان ڕوی پێ ئەكەنە ئایینی ئیسلام ئەوەیە كە ئەڵێن بۆچی ئەم ئاینە ڕێ ئەدات پیاو لە هاوسەرێكی زیاتر هەبێت؟ بۆ چ وەكو دیانەكان لە وڵاتەكانی ڕۆژهەڵات و ڕۆژئاوا نابێت دەستی بە سەر هاوسەرێك زیاتر هەبێت.

یەكێك لەو ئایین وەرگەڕاوانە وتویەتی، ئەگەر دروست بێت پیاو لە كاتێكدا لە هاوسەرێك زیاتری هەبێت بۆ دروست نیە ئافرەتێك لە مێردێك زیاتری ببێت؟ ئەگەر ئەو زیادەیە بۆ پیاو ڕێكو تەواو بێت، ئەبێت بۆ ئافرەتیش هەر وابێت.

ئنجا ئێمە لەم ڕووەوە هەندێك ئەدوێینو پوچەڵی ئەو ڕەخنەو قسانە ئاشكرا ئەكەین، بەڵام لە پێشان ئەم دو خاڵە ئەخەینە بەرچاو:

أ - ئەوەی ئەڵێت بۆ چ دروستە پیاوێك لە كاتێكا لە هاوسەرێكی زیاتر هەبێت و دروست نیە ئافرەتێك لە كاتێكدا لە مێردێك زیاتری ببێت. ئەو كەسە پێی ئەوترێت بەڵێ دروست نیە، چونكە ئەگەر دایكت دو سێ مێردی ببوایە تۆ باوكی خۆت نە ئەناسیەوە نەت ئەزانی كام مێردیان باوكتە، ئنجا بۆ ئەوەی تۆ بزانی كێ باوكتە نابێت دایكت دەستی لەگەڵ مێردێك زیاتر بەند بێت.

ئەمە لە لایەك لە لایەكی دیكەوە دیارو ئاشكرایە، دەستوری كۆمەڵایەتی لە لایەن خێزان داریەوە بەندە بە بەند بونی ئافرەت لە یەك كاتدا بە یەك مێردو بەس، چونكە مێردەكەی ئەزانێت ئەو منداڵانەی لەو ئافرەتە ئەبێت بێگومان هەمویان نەوەی خۆیەتیو

پارچەییکن لە گیانو هەناوی، لەبەر ئەمە خۆشەویستیان دڵی داگیر ئەکاتو بە باشی هەوڵ ئەدات ژیانو گوزەرانیان بە جوانی بۆ برەخسێنێت، نێرەکانیان تا ئەگەنە رادەی مرۆڤایەتیو، مێیەکانیش تا ئەکەونە ژێر سێبەری مێردەکانیان.

بەڵان ئافرەتێك ئەگەر بەندایەتی لەگەڵ پیاوێك زیاتر بوو چەند منداڵێکی بو کام مرۆڤیان خۆی بە باوکیان ئەزانێتو رەحمی هەڵیئەگرێتە سەر ئەوەی چاوەدێریان بکاتو دەستی باوکایەتیان بە سەرا بێنێت.

ب- ئایا وایە (هەر وەکو ئەڵێن) دیانەکان لە وڵاتە رۆژئاوایەکانو رۆژهەڵاتییەکان هەر یەکە دەستی لەگەڵ ئافرەتێك بەندە کە هاوسەریەتیو نابێت لەگەڵ ئەوا ژنێکی دیکەی هەبێتو دەستی لەگەڵیا بەند بێت؟ بێگومان نا وانیە. چونکە ئەوانە ئەگەر بە پێی راکێشانی کەنیسە بە زاهیری لە ژنێك زیاتر هێنانیان لا قەدەغە بێت، بە نهێنی رو کردنە ئەم زیادەیە بە بێ شەرم وعەیب و حەرام بون یان رێك دروستە.

زۆربەی دانیشتوانی ئەو وڵاتانە کە هەر یەکە بە حەڵاڵی دەستی بە دەستی ژنێکەوەیە، بە نهێنیو حەرامی دەستی لەگەڵ چەند ئافرەتێکی دیکە تێکەڵاوەو دڵی پێیانەوە بەندەو لە هاوسەرەکەی زیاتر لە گەڵیان رائەبوێرێت. واش ئەبێت ژنی یەکێك لەوانە کە بە کردەوەی مێردەکەی هەست ئەکات ئەویش بۆ خۆی دەست لەگەڵ دۆستێك یان زیاتر لە دۆستێك بەند ئەکات، وا ئەبێت مێردەکەی بەمە ئەزانێت بەڵام چاوی لێ ئەپۆشێو دەنگ ناکات.

ئنجا ئەگەر مرۆڤێکی مسوڵمان دەستی بە حەڵاڵی لەگەڵ ئافرەتێك زیاتر بەند بێت – کە ئاین سنورێکی بۆ داناوەو بۆ دروست بونی روکردنە ئەو زیادەیە چەند مەرجێکی بڕیارداوە. بەشی زۆری مرۆڤانی ئەو وڵاتانە بە حەرامی دەستی لەگەڵ چەند ئافرەتێك بەندەو هەر رۆژەی بە پاڵ یەکێکەوەیە، بەبێ ئەوەی یاساو قانون قەدەغەیەکی بۆ دابنێت‌و کۆمەڵایەتیش بە عەیب‌و حەرامی بزانێت‌و شەرم‌و حەیا روبکاتە یەکێك. ئەمە کارێکە گومان هەڵناگرێت، ئەوانەی رو ئەکەنە ئەو وڵاتانە ئەمەیان لا ئاشکرایە و باشی ئەزانن.

بۆ دور بڕۆین، سەرۆکی کۆماری فەرەنسای پێشو (میتەران) لەگەڵ ئەوەی هاوسەری مارەکراوی هەبو، بە ئاشکرا بەندایەتی لەگەڵ ئافرەتێکی دیکە بەستبوو لەگەڵی ڕای ئەبوارد، ئەمە بە ئاشکرا جگە لەوەی کە بە نهێنی بووەو رویتێکردوە.

وەلی عەهدی بەریتانیا (ئەمیر چارلز) لەگەڵ ئەوەی (دەیانا) هاوسەری مارەکراوی بوو دو کوڕی لێ هەبو، دەستی لەگەڵ ئافرەتێکی دیکە تێکەڵاو کرد بو بە ئاشکرا لە گەڵی رای ئەبوارد، ئەم کارە وای کرد بەینی لەگەڵ (دەیانا) تێك بچێت‌و لێك جیاببنەوەو هەردولا دەری بخەن کە رویان لە دامێن پیسی کردوە تاکەنیسە بە تەڵاقدان رێبدات.

هەروەها – سەرۆکی کۆماری ئەمەریکا پێش جۆرج بۆش (بل کلنتن) لەگەڵ ئەوەی هاوسەرێکی هەیە لەو جێیەی پێی ئەڵێن (کۆشکی سپی) واتە سەرای کۆماریەتی دەستی لەگەڵ کچێك تێکەڵاو کردبو دامێن پیسی لەگەڵ ئەنواندو کچە بە بێ هیچ شەرمێك دانی بەمەیانا، بەرلەمانیە جمهوریەکان لە بەرلەمان ئەمەیان لێ کردە هەرا تا لە سەرۆکایەتی کۆماری لایبدەن‌و ئیستقالەی پێبکەن، نەك لە

بەر ئەوەی ئەو کارەیان پێ عەیب بو، بەڵکو لەبەر رقەبەری حیزبایەتی لەگەڵ دیموکراتیەکان کە ئەو سەرۆکیان بو (بل کلنتن) ئەمەی لێ ئاشکرا بو، ئەوەبو کە بە ئێزگە بە هەمو عالەما بلاّو کرایەوە، ئنجا ئەبێت بە دزی دەستی لەگەڵ چەند ئافرتی دیکە تێکەلاّو بوبێت.

هەروەها لەم رۆژانەیا - کە ئەمە ئەنوسم - دەرکەوت و لە ئێزگەکان بلاّوکرایەوە کە سەرۆکی کۆماری ئیسرائیل (کاتساف) بە خورتی دامێن پیسی لەگەڵ ئافرەتێك نواندوەو بۆ هێنانەدی ئەو کارە شەڕی بە چەند کچێك فرۆشتوە، لەگەڵ ئەوەی کە خاوەنی هاوسەرە.

ئەم کردەوەیەی ئێستاکە دراوەتە دادگاو لێپرسیاری، ئەم رۆکە واتە ٢٠٠٧/١/٢٥ من لە تەلەفزیۆن (کاتسافم) دیت بە پەشۆکاوی و بە تورەیی داوای لە پەرلەمان کرد تا دەرکەوتنی محاکەمە کە ئیجازەی بدەنێ. لە پەرلەمانیش داوای لێکرا کە خۆی لە سەرۆکایەتی کۆمار بکێشێتەوە.

بلاّوبونەوەی دامێن پیسی لە ناو کۆمەلاّ لەو ولاّتانەیا هەندێك قەڵەم بەدەستیان و باش تێڕوانی هەڵگرتۆتە سەر ئەوەی خراپی ئەم کارە چلّکنە حەرامە دەربخەن و داوا بکەن رێ بدرێت مرۆڤ بتوانێت لە ئافرەتێك زیاتر مارە بکات.

فەیلەسوفی بە ناوبانگی ئەڵمانی (شۆبنهۆر)، وتویەتی رۆژهەلاّتیەکان مەبەستی مسوڵمانەکانە - رێی راستیان خستۆتە بەرچاو کە بڕیاریان داوە مرۆڤ بتوانێت لە کاتێکا لە ژنێك زیاتر مارە بکات، ئەمە کارێکە ژیان رێی پێ ئەدات و بە پێویستی دائەنێت، هەروەها ئەڵێت زۆر عەجایەبە کە ئەوروپاییەکان رەخنە لەمە ئەگرن بەلاّم خۆیان بە کردەوە دوای ئەکەون، وابزانم ئەوانە کەسێکیان تێدا نیە کە بە ڕاستی دەستی بە

دەستی یەك ژنەوە بێت‌و ڕو لە هیدیکە نەکات [1].

هەر لەم رووەوە زانیاری ئیجتیماعی (جۆستاف لۆبۆن) ئەڵێت: لە ژنێك زیاتر هێنان بە حەڵاڵی لای مسوڵمانەکان گەلێك باشترە لە بە حەرامی روتێکردنیان لە لایەن ئەورپیەکان کە منالّ بونی زۆڵی لێ رو ئەدات.

هەروەها ئەبینن ئافرەتێکی خاوەن قەڵەمی ئینگلیزی لە غەزەتەی (لەندەن ثروت) وتارێکی بلاوکردۆتەوە تیا ڕای زانیاری عیلمی ئیجتیماعی (تۆمس) پەسەند کردوە کە وتویەتی هیچ رێگایێك نیە رابوەستێت بەرامبەر ئەو کچانەی کە ڕو ئەکەنە دامێن پیسی تەنیا ئەوە نەبێت کە ریّ لە ژنێك زیاتر هێنان بدرێت‌و مرۆڤان بتوانن لە هاوسەرێك زیاتر بۆ خۆیان بێنن [2].

هەیئەتی ئومەمی موتەحیدە لە ساڵی ۱۹۵۹ ئامارێکی بلاوکردەوە، تیایە دەری خست کەنسبەتی منالانی بێباوکی زۆڵ لە ولاتانی رۆژئاوا گەیشتۆتە لەسەد شەست، ئەمە لە هەندێك ولاتانا نسبەتەکەی گەیشتۆتە لەسەدا حەفتاو پێنج وەکو ولاتانی (پەناما) هەروەهاش لە ئەمریکای لاتینیش.

ئەم نسبەتە کە لە ساڵی ۱۹۵۹ وا بوبێت ئەبێت ئیستاکە نسبەتەکەی گەیشتبێتە چ رادەیێك لەو ولاتانەی کەلە شورەی رەوشت بەرەلابون‌و ڕوکردنە دامێن پیسی تیانا وەکو ئاو لێخواردنەوەی لێهاتوە.

ئەو ئامارە وانیشان دەدات کە ئەو نسبەتە لەولاتەکانی مسوڵمانەکاندا هیچ بونێکی نیە، واتە سفرە.

---

١) زانیاری دانای بەرز محەمەد زاهیدی کەوسەری: (الاحکام الشرعیة للاحوال الشخصیة) الأحوال الشخصیة، لاپەڕە ١٩٨

٢) تەفسیری مەنار ٤/٢٢٨ هی سەیید رەشید رەزا.

لە کۆماری میسری عەرەبی کەزیاد حەزارەتی ڕۆژئاوا ڕوی تێکـردوە ئەو نسبەتە یەك لەسەدا کەمترە.

ئەم ئامارەی هەیئەتی ئومەمی موتەحیدە لە ســـــاڵی ١٩٦٠ غەزەتەی (هیندۆســـتان تایم)لە مانگی ئەیلول لە ژمارەی دوانزەی غەزەتەکە بلاَوی کردۆتەوە.

خاوەنی غەزەتەکە ئەلێت وڵاتە مسوڵمانەکان لـەم بەڵایەلـە- واتـە منالاَنی زۆڵـی بێبـاوك – دورن چـونکە لـەژنێك زیـاتر هێنـا نیـان لاقەدەغەنیە وەکو وڵاتەکانی دیکەی غەیرە مسوڵمان.

ئنجا ئێمە ئەڵێین ئەگەر ئەمە هۆکاریك بێت، بەڵان هۆکاری دیـارو ئاشکرا ئەوەیە کە ئاینی ئیسلام زینای بە گونـاهیکی گـەورە دانـاوە و حەرامی کردوە سزای تایبەتی بۆداناوە.

ئەگەر ئەم کارە لە نێـوان پیـاوو ئافرەتێـك ڕوبـدات – کـە زۆر بەکەمی ڕوئەدات – ڕودانەکە زۆر بە نهێنی دێتەدیو ڕێی منــــاڵ بونی لــێ ئەبڕدرێت.

دوای ئەوەی ئەو دوو خاڵەمان خستە بەرچاوو کەمێك لێی دوایـن ئنجا با ڕوو بکەینە لاێیکی دیکەی باسەکەو بە چەند خاڵێك رونـی بکەیەنەوەو لێی بدوێین.

پێش هاتنی ئاینی ئیسلام فرەژنی لەلای عەرەبەکان—هەروەها لەلای میللەتەکـانی تریش عورف وعادەتی ئەوکاتە بوە. مرۆڤی وابوە لە یەك کاتدا دەستی مێردایەتی بەسەر دە ئافرەت یان لە دە ئافرەت زیاتر بوە.

دەستی مێردایەتی بەسەر زۆر ئافرەت گرتن شایەد بوە لەسەر تواناو ماقوڵییو لەبەرچاوبونو شەرەفداری ئەو کەسە بوە لەناو هۆزو کۆمەڵا.

ئاینی ئیسلام دوای هاتنی بە نزیکەی هەشـــت ساڵ لە کاتێکا زیاد

لە چوار ژن هێنانی قەدەغە کردو ڕێی ئەوەی دا کە پیاوێك تا چوار هاوسەری هەبێت، بە مەرجێك بتوانی عەدالەت لە بەینیان بێنێتەدی لە ڕابواردنو ئیدارەو جلو بەرگو خانەنشینیو هەمو کارێکی تری خێزانداری، تەنها خۆش ویستن نەبێت، چونکە ئەوە کارێکە بەندایەتی بە دڵەوە هەیە کە مرۆڤ ناتوانێت عەدالەت لە خۆشویستن لە بەینی هاوسەرەکانیدا بێنێتەدی.

لەگەڵ ئەمەیا بڕیاری دا ئەگەر مرۆڤ ترسی ئەوەی هەبو کە ناتوانێ عەدالەت بەجێ بێنێت نابێت لە هاوسەرێك زیاتر بێنێت. خوای بەرزی بێوێنە لە ئایەتی (٣) لە سورەتی (النساء) ئەفەرموێت: ﴿.. فَانكِحُواْ مَا طَابَ لَكُم مِّنَ النِّسَاء مَثْنَى وَثُلاَثَ وَرُبَاعَ فَإِنْ خِفْتُمْ أَلاَّ تَعْدِلُواْ فَوَاحِدَةً﴾[١].

ئاینی ئیسلام فەرمانی نەداوە بە فرە ژنی بەڵام ڕێی لێ نەگرتوە چونکە ئاینێکی عەمەلییە، تەماشای زروفو کاتو پێویستی کۆمەلایەتی ئەکاتو، بەو پێیە یاساو قانون دادەنێت، تەمەشای کردوە کە هەندێك حاڵو زوروف وا ئەخوازێ کە پیاو بتوانێت لە ژنێك زیاتر مارە بکات، هەندێك لەو حاڵو زروفانە ئەمانەن کەوا لەم خاڵانەی کەوا دێن ئاماژەی بۆ ئەکەین.

١- پیاو لە ئافرەت زیاتر خەتەرو لەناوچون لە هەمو ڕوێکی ژیان ڕوی تێئەکات، وەکو کارکردن لە کارگە گەورەکانو لەناو کانگاکانو سەفەرکردن بە ئۆتۆمبێلو کەشتیو فرۆکەکان، هەلاکەتو لەناوچون

---

١) واتە: لەو ئافرەتانەی کە بە دڵتانە، ئەتوانن یەکێك یان دوان یان سیان یان چوار مارە بکەن بەمەرجێك عەدالەت لە نێوانیان بێننەدی، بەڵام ئەگەر ترسی نەتوانینی عەدالەت هێنانەدیتان بو ئەبێت هەر ئافرەتێك بە هاوسەر بگێڕن. دوای ئەمە ئەڵێم فەرمایشتی خودا کە ئەفەرموێت: (فانكحوا....) فەرمان نیە لە ژنێك زیاتر هێنان، بەڵکو مەبەست پێی ڕێپێدانو دروست بونە، وەکو فەرمایشت کە ئەفەرموێت: (... واذا قضيت الصلاة فانتشروا...)

بە زۆری ڕو لە پیاو ئەکات لە کاتی بڵاوبونەوەی نەخۆشی سەختی بە هیلاك بەرو لە کاتی هەڵگیرسانی شەڕی بەهێز لە بەینی دەوڵەتەکان.

ئەمانە وا ئەبەخشن کە ژمارەی ئافرەت لە هەمو جێیێك بە چەند جار زیاتر بێت لە ژمارەی پیاو. ئنجا لە ناو کۆمەڵا هەر پیاوێك ئافرەتێك مارە بکات بەبێ ئەوەی پیاوێك بەرەبەنی بمێنێتەوە ئەبینین بەشێکی زۆر لە کچانی عازەب بە بێ مێردن‌و بەشێکی زۆریش لە ئافرەتان کە مێردەکانیان لە شەڕا بەر هەلاکەت کەوتون‌و بەبێ ئیدارەو کەس‌وکارو مێرد ماونەتەوە.

بەشێك لەوانە بە کچەکان‌و بە بێوەژنەکان زروف وایان لێ ئەکات بە ئاشکراو بە نهێنی ڕوبکەنە خەراپەو دامێن پیسی کە منالی زۆری لێ رو ئەدات – ئەمە کارێکی دیارو ئاشکرایەو گومان هەڵناگرێت لە وڵاتەکانی ئەورروپا، بەمە کۆمەڵایەتی لە چەند ڕوێکەوە خەراپەو شڵەژان روی تێ ئەکات. بەڵام ئەگەر ڕێ بۆ ئەو مرۆڤانەی هەبوو توانادارن لە ژنێك زیاتر بێنن، تا رادەیێك لەناو کۆمەڵا بەر لەو خەراپەو شڵەژانە ئەگرێت.

بۆیە ئەبینین مەجلسی نورنبرج لە ئەورروپا لە ساڵی (١٦٥٠) دوای ئەو شەڕانە رویدا بڕیاریدا کە پیاو بۆی هەیەو ئەتوانێت لە ژنێك زیاتر مارە بکات، کە دیتیان ئەو شەڕانە بەشێکی زۆری لە مرۆڤەکان قوتداو ژمارەیێکی زۆر لە ئافرەتان بەبێ‌هاوسەرو بەبێ ئیدارەو گوزەران‌ماونەتەوە.

هەروەها بۆیە ئەبینین دوای جەنگی جیهانی دوەم کە چوار ساڵ بەردەوام بو بەشێکی زۆر لە ئافرەتانی ئەڵمانیا خۆنیشاندانێکیان کرد بۆ ئەوەی ڕێ بدرێت پیاو بتوانێت لە ئافرەتێك زیاتر مارە بکات، چونکە دیتیان ژمارەی ئافرەتان بۆتە نۆ چەندانەی ژمارەی مرۆڤەکان، چونکە

شەڕ بەشێکی زۆر ئەستوری لە مرۆڤەکان لەناو بردبو بوبوە هۆی بڵاوبونەوەی دامێن پیسێیکی زۆر لە بەینی ئافرەتەکانیانو ئەفسەرو سەربازەکانی ئەمەریکاو فەرەنساو ئینگلیز بە شێوەیێك زۆر منالّی زۆڵی لە دایك بوی تازە فڕێ ئەدرانە ناو کۆڵانو باغچە گشتیەکان، کە ئەمە ئەرکێکی زۆری بۆ کار بەدەستان بەرهەم هێنابو.

لەم روەوە دکتۆر محمد یوسف ئەڵێت: منو مامۆستاییکی زانای برادەرم لە ساڵی (١٩٤٨) دەعوەت کراین لەگەڵ بەشێك لە زاناو تێگەیشتو لە دەرونناسیو کۆمەڵناسی لە ئەوروپا بۆ کۆنگرەیێکی گەورە لە (مونیخ) لە ئەڵمانیا بۆ رێ دۆزینەوەی چارەکردنی زۆر بونی ئافرەتان بە چەند جارێك لە ژمارەی پیاوانو بڵاوبونەوەی ڕەوشت خەراپیو دامێن پیسی هەروەها بۆ چۆن چارەسەرکردنی ئەو گرفتە.

ئەڵێت لە کۆنگرەکە چەند رایەكو رێگایەك خرایە بەرچاو، بەڵام دوای لێکۆڵینەوە یان هیچ کامێکیان پەسند نەکردرا. بەڵام منو ئەو مامۆستایەی کە لەگەڵم بو دەرمان خست کە باشترین رێ بۆ ئەم چارەسەریە ئەوەیە کە ڕێ بدرێت – وەکو ئایینی ئیسلام – مرۆڤان بتوانن لە ژنێك زیاتر مارە بکەن، ئەگەر ئەمە بە تەواوی گرفتەکە بنبڕ نەکات بەشێکی زۆری لێ کەم ئەکاتەوە. ئەڵێت ئەم ڕایە کە خرایە بەرچاوو لێکۆڵینەوە پەسند کراو کۆنگرەکە بڕیاری لە سەرداو دوای ئەمە دانیشتوانی (بۆن) کە لەوکاتە پایتەختی ئەڵمانیا بو داوایان کرد کە دەستوری وڵات بەندێکی تێبخرێت کە رێ بدات بۆ لە ژنێك زیاتر هێنان.

بۆ چ دور بڕۆین حکومەتی بەعث لە عێراق لە کاتی خۆی مادەیەکیان خستە قانونی ئەحواڵی شەخصی، کە نابێت کەس لە ژنێك زیاتر مارە بکات تەنیا بە رێدانی قازی نەبێت، بەڵام کە شەڕ

لە نێوان عێراق‌و ئێران ڕویداو هەشت ساڵی خایاند، دیتیان بە هەزاران کەس کوژران‌و ژنەکانیان بە بێوەژنی و بەبێ ئیدارەمانەوە، ئەمە گرفتێکی گەورەی بۆ وڵات نایەوە.

مەجلسی قیادەی ثورة بە ژمارە (١٧٠٠) لە ١٩٨٨/١١/١٢ بڕیاری بە لابردنی ئەو ماددەیە لە قانونەکەداو ڕێیدا بە ژنێك زیاتر هێناندا بەبێ ئەوەی پێویستی بە ڕێدانی قازی هەبێت.

٢- وا ئەبێت پیاوێك ئافرەتێك بە هاوسەر ئەگیرێت پاش ماوەییك ژنە توشی نەخۆشییێکی وا ئەبێت کە نابێت لەگەڵ مێردەکەیا ژنایەتی‌و مێردایەتیان لە بەینا روبدات، نەخۆشیەکەش لە سنوری تیمار کردن ئەچێتە دەرەوەو مێردەش لەکاتی شۆخی‌و گەنجایەتیا ئەبێت‌و پێویستی تەواوی بە ئافرەت ببێت. ئنجا لەم حاڵەتەدا یان ئەبێت ڕێ بدرێتە مێردە تا روبکاتە عەرزو ناموسی خەڵك‌و دامێن پیسی، یان ژنەکەی بەو نەخۆشیەی لەسەریەتی تەڵاق بدات بۆ ئەوەی بتوانێت ژنێکی دیکە بێنێت ئەگەر ژنهێنانی لێ قەدەغەبێت، یان قەدەغە نەبێت‌و مێردە بتوانێت رو لە ئافرەتێکی دیکە بکات‌و مارەی بکات‌و لە هەمان کات بە چاوی قەدرو حورمەت تەمەشای ژنە نەخۆشەکەی بکات. ئنجا بڕواناکەم خاوەنی بیروهۆشی تەواو لەم ڕێیەی سێیەم لابدات‌و لای دورست نەبێت مێردە ژنێکی دیکە بێنێت.

ئەشێت یەکێك بپرسێت ئەگەر حاڵەکە بە پێچەوانە بو، مێردە توشی ئەو نەخۆشیە بو ژنە پێویستی بە یەککگرتن لەگەڵ مێرد هەبو. لەم حاڵەیا ژنە ئەتوانێت داوا لە قازی بکات تا پەیوەندی لەگەڵ مێردەکەیا بپچڕێت، ئەگەر مێردە نەیویست تەڵاقی بدات.

٣- وا ئەبێت ئافرەتێك ئەیەوێت شو بكات‌و لەژێر سێبەری مێردا ژیان بەرێتە سەر بەڵام كزی جنسی لائەبێت، ئنجا كە مێرد ئەكات ئەوەندە حەز بە جوت بون لەگەڵ مێردەكەی ناكات، بەڵام مێردەكەی لە كاتی شۆخی‌و تیژی گەنجایەتی ئەبێت‌و بە زۆری بەبێ ئەو جوت بونە نەبێت ئیدارەناكات، لەم حاڵەتەیا ئەگەر ژنهێنانێكی دیكەی لێ قەدەغەبێت ئەبێت ژنەكەی تەلاق بدات تا بتوانێت رو لە ئافرەتێكی دیكە بكات، ئنجا ئایە ئەمە باشترە یان رێی ژن هێنانێكی دیكەی هەبێت‌و ژنێكی دیكە بێنێت‌و ژنی یەكەمیشی بەخۆشی لە ژێر سێبەریا ژیان بەرێتە سەر.

٤- وا ئەبێت پیاوێك ژنێك مارە ئەكات، دوایی بۆی دەرئەكەوێت ژنەكە نەزۆكەو منالی نابێت، بەڵام مێردە زۆر حەز لە نەوەو منداڵ ئەكات، ئنجا ئایە باشتر ئەوەیە ئەو مرۆڤە ژنەكەی تەلاق بدات‌و بەبێ ئیدارەو مێردو گوزەران بمێنێتەوە، تا بتوانێت ژنێكی دیكە بێنێت ئەگەر بۆ ئەم ژن هێنانە رێگا نەبێت، یان ئەم رێگایەی بۆ هەبێت، تا بە جوانی هەردو ژنەكەی لەژێر باڵی خۆی بحەوێنێتەوە.

٥- ئافرەت بە زۆری دوای تەمەنی چل ساڵی ئەو پەڕەكەی تا چل‌و پێنج ساڵی توانای منالّ بونی نامێنێت‌و زگ ناكات، لە كاتێكا مرۆڤی وا هەیە تا تەمەنی هەشتا ساڵی‌و نەوەت ساڵی بە یەك گرتن لەگەڵ ئافرەت توانای ئەو رەخساندنەی ئەبێت.

ئنجا ئەگەر ئافرەتێك شوی كرد بە یەكێك لەم شێوە مرۆڤانەو لە زگ كەوتن كەوت‌و پیاوەكە زۆر بۆ نەوەو منداڵ زۆر تینوێنی بو هەروەها لە ماڵو بەدەنا توانا داربوو ئارەزوی هێنانی ژنێكی كەی

کرد بۆ رێی نەبێت ژنێکی دیکە بینێت‌و بیخانە پاڵ ژنی یەکەمی‌و ژیانیان بە باشی بۆ بڕەخسێنیّ‌و چاوی رون بێت‌و دڵی گەش بێت بە منالاَنی لە ژنی تازەی‌و نەوەو نەتەوەی زۆربێت لەناو کۆمەڵ‌و ولاَتدا، چونکە زۆری ئەندامان تیانا مەرجێکە لە مەرجەکان بۆ پێش کەوتنی شارستانییەت و حەزارەت.

٦- شێوەی ژیان‌و ئیدارەی هەندێك کەس وا ئەخوازێت لە ژنێك زیاتر مارەبکات، بیەوێت یان نەیەوێت.

ئەوانەی لە لادێیەکان دائەنیشن روئەکەنە گەلێك کار، لە لاێیك خەریکی زەوی کێلان‌و زەراعەت‌و چاندنی باغەوباغاتن، لە لاێیکی دیکەوە خەریکی بەخێوکردنی مەرومالاَتن‌و ئەوەی لێیان روئەدات ئەبێت بە باشی دەسگیری بکەن، چونکە لاێیك لە لایەکانی گوزەرانیان بۆ ئەرەخسێنیّ وەکو شیرو رۆن‌و ماست‌و پەنیرو خوری.

هەستان بەم کارانە پێویستی بە چەند دەستێك هەیە لە پیاو و لە ئافرەت، ئەو کارانەی کە ئافرەت پێی هەڵئەستیّ وا ئەبێت بە یەکێك نەیتەدی، ئەبێت لە یەکێك زیاتربێت، هەروەها ئەو کارانەی کە ئەبێت پیاو پێی هەڵستی وا ئەبێت لە توانای مرۆڤێك زیاتر بێت.

ئنجا لەم شێوە رابواردنەدا کار وا ئەخوازێت کە پیاو ئەبێت لە هاوسەرێکی زیاتر هەبێت تا ئەو کارانەی کە ئەبێت ئافرەت پیّ هەڵبستێت بەباشی بڕەخسەندریّ‌و بەرێکی بێتەدی، هەروەها لێرەدا کار وا ئەخوازیّ کە ریّ هەبێت مرۆڤ بتوانێت لە ئافرەتێك زیاتر مارەبکات، تا نەوەی لە نێرومیّ بێتەرو، کچەکان کە گەورەو عازەب ئەبن بە کارەکانی لاێیك لە کارەکانی دایکیان هەڵئەستن‌و ئەرکی سوك ئەکەن.

## دەست بەسەر ئەسیرا گرتن

ڕەخنەیەکی کەی لەو ڕەخنانەی کە دوژمنانی ئایینی ئیسلام لە ئایین وەرگەڕاوەکان روی پێنەکەنە ئەم ئایینە ئەوەیە کە ئەڵێن ئەم ئایینە یاسای بۆ دەست بەسەر کۆیلەگرتن داناوەو ئەسیر لەژێر ڕەشماڵی ئەم ئایینە لە ژیانێکی ناخۆشابوەو دەستی کوشتنی بۆ درێژکراوە.

پێش ئەوەی پوچەڵی ئەم ڕەخنە دەربخەین‌و لەبەرچاو ئاشکرای بکەین پێویستە بزانین میللەتانی پێشو بە چ چاوێك تەماشای ئەسیریان کردوەو چۆن مامەڵەیان لەگەڵ نواندوە.

سۆمەریەکان هەرکەسێکیان بە ئەسیر بگرتایە بە کۆیلەیان ئەگێراو ئیشوکاری سەختیان پێیان ئەهێنایە دی‌و ئەوەی لەلایان لە پێویست زیاتر بوایە ڕوی کوشتنیان تێ‌ئەکرد.

بابلیەکان هەرکەسێکیان لە ناحەزەکانیان بگرتایە زۆر بە ئازارو توندی‌و خراپی ڕویان تێ‌دەکرد.

پاشاکەیان (بوخت نەسر) کە هێرشی بردە سەر وڵاتی شام و فەلەستین شمشێری سەربازەکانی جولەکەکانی ئەدوریەوەو ئەوەی لێیان ئەمایەوە ئەکرا بە کۆیلەو ژیانی تاڵ‌و سەختیان پێیان ئەچێشت.

جولەکەکان لەکاتی خۆی کە بەسەر کەنعانیەکانا سەرکەوتن‌و بەشێکی زۆریان دوای تەواوبونی شەر لێیان کوشت‌و چی ماڵ‌و سامانیان هەبو داگیریان کردو ژنەکانشیان بە دیل‌و کۆیلە بریاردا.

کۆرشی ئیرانی کە بەسەر بابلیەکان سەرکەوت‌و قودسی لەدەستیان ڕزگار کرد جولەکەکان ٣٥ هەزار ئەسیری بابلەیکانیان لە کۆڕشی

کرێو بەهەمو شێوە سزاو ئازاردانێك ڕویان تێیان کردو هەمو کینەیکی دڵیان پێیان ڕشت[1].

ئەمە هەمو کاتێك پیشەو کردەوەی جولەکەکان بوە لەگەڵ ناحەزو دوژمنەکانیان ئەگەر هەڵی سەرکەوتنیان بۆ ڕێك بکەوتایە بەبێئەوەی جیاوازیەك لە بەینی گەنجو پیرو ئافرەتو منداڵ بکەن، چونکە بە دڕندەییو بەبێ مروەتی ڕوکردنە دوژمنەکانیان بە خوا پەرستی ئەزانی.

ئەوانە ئەگەر ڕوویان بکردایە شارێك ئەگەر دانیشتوەکانی شارەکە بەبێ شەڕکردن دەستیان بۆیان درێژ بکردایەو لەگەڵیان ڕێك بکەوتنایە ئەوانەیان بە دیلوکۆیلە ئەگێڕاو دەستیان ئەخستە سەر هەمو هەبویەکیان، بەلام ئەگەر بەشەرکردن شارەکەیان داگیر بکردایەو بەسەر دانیشتوەکانی سەربکەوتنیایە شمشێریان ڕو پێئەکردە ملی هەمو پیاوێکیان، ژنو منداڵەکانیشیان بە دیلو کۆیلە ئەگێراو دەستیان بەسەر هەمو ماڵو مالاتو هەبویەکیان ئەگرت ئەوانە ئەمەیان ئەکرد بەپێی بریاردانی خاڵی بیستەمی سی پارەی (تەثنەی تەوراتیان)کە ئەلێت، ئەگەر بۆ شەرکردن ڕوتان کردە شارێك داوا لە دانیشتوەکانی بکەن تا دەستیان بۆتان درێژ بکەن ئەگەر قایل بونو شەڕیان لەگەڵتان نەکرد هەمو ئەو دانیشتوانە ئەبنە کۆیلەو بەندەتان، بەلام ئەگەر دەستیان بەملکەچی بۆتان درێژ نەکردو شەڕیان لەگەڵتان کردو خودا ئێوەی بەسەریان سەرخست بە شمشێر ڕو بکەنە هەمو پیاوەکانی، ژنەکانو منداڵەکانیان بکەنە کۆیلە ماڵومالاتیان کە لە شارەکەیان هەیە هەموی تالآن بکەن.

---

1) شخصیە ذی القرنین نوسینی ئەبو الکلام ئازاد ، لاپەڕە (٣٥– ٣٦). اسری الحرب عبر التاریخ نوسینی عەبدولکەریم فەرحان، لاپەڕە (٣٥).

مەغۆڵەکان کە خوراسیان داگیرکرد ٧٠ هەزار کەسیان تیا سەربڕی، کە ڕویان کردە شاری (مەرو)و داگیریان کرد دانیشتوەکانی شارەکەیان بەسەر سەربازەکانیان دابەش کرد تا سەریان بە شمشێر بپەڕێنن تەنیا (٤٠٠)کەسیان نەبێت بۆ ئەوەی هەندێك کاروباری لەشکریان بۆ بێننە دی لە شاری هەرات (١٠٠) هەزار کەسیان تیا کوشت، کە ڕویان کردە شاری بوخارا بە تەواوەتی وێرانیان کردو بەشێکی زۆریان تیا کوشت[1].

هۆلاکۆ لە ساڵی ٦٥٦ی کۆچی کە بێ شەر چوە بەغدا، خەلیفەی ئەوکاتە (موستەعصم) پەیمانی لێ وەرگرت کە دەستی خەراپە بۆ کەس درێژ نەکا، بەڵام هۆلاکۆ پەیمانی خستە پشتگوێ‌و فەرمانی دایە سەربازەکانی کە ملی هەمو کەسێکی تیا بپەرێنن، کوشتارو بڕین‌و تالاَن کردن‌و دەست بۆ ئافرەتان درێژکردن‌و خانو بەسەر دانیشتوان ڕوخاندن نزیکەی چل ڕۆژ بەردەوام بو هەندێك مێژونوسان ئەڵێن لەم شارە نزیکەی ملیۆن‌و نیوێك کەس گیانی لێسەندرا، خەلیفە خۆیی‌و دو کوڕی بە فەرمانی هۆلاکۆ بەر کوشتن کەوتن، کەسانی تری خەلیفە لە ماڵ‌و منداڵ‌و ئافرەتان دیلایەتی‌و کۆیلایەتیان بەسەرا بریار درا[2].

تەیمورلەنگ کە (أصفهانی) داگیرکرد بە کوشتن ڕوی کردە بەشێکی زۆری دانیشتوەکانی‌و هەرەمێکی لە مێشکەسەری١٧٠ هەزار کەس دروست کرد، لە تکریت هەروەها ڕوی کردە ئەم ڕەوشتە، تیادا دو هەرەمی لە مێشکەسەری هەزارکەس بڵندکردو بە گەچ لە یەکیانی قایم کرد[3].

---

١) تاريخ الاسلام السياسى والدينى والثقافى والاجتماعى، جزمی چوارەم لاپەڕەی(١٤٠) نوسینی دکتۆر حەسەن ئیبراهیم حەسەن .

٢) کتێبی پێشو لاپەڕە (١٥٤– ١٦١).

٣) اسرى الحرب عبر التاريخ ١٤٢-١٤٣.

کە دەستی بەسەر شاری (شاما) گرت تیایدا ڕوی کردە هەمو ناڕەوایێكو ڕێی دایە سەربازەکانی کە ئەوەی ئەیانەوێت بیکەن لە کوشتنو تاڵانکردنو دەستی بێناموسی بۆ ئافرەتان درێژکردن[١].

دیانەکان لە شەڕا لە هەمو کاتێکدا کردەوەیان هەر خراپیو بەدڕەوشتی بوە بەپێچەوانەی فەرمانەکانی جەنابی عیسای پێغەمبەریان سەلامی خوای بەسەر بیارێ، ئەوانە لەگەڵ دوژمنەکانیان هەمو شێوە ناڕەواییان نواندوە، لە کوشتنی ئەسیرو منداڵو ئافرەتو پیاوی پیری بێدەسەڵاتو تاڵانکردنو دەستی خراپە بۆ ئافرەتان درێژکردن.

صەلیبیەکان وەکو درندەی برسی ڕویان ئەکردە شارەکانو دانیشتوەکانی، هەمو مەرامێکیان تاڵان کردنو کوشتنو دەستی دامێن پیسی بۆ ئافرەتان درێژکردن بو. ئەوانە کە شاری (قودسیان) داگیرکرد حەفتا هەزار کەسیان تیا سەربڕی، لە شاری (معرة النعمان) ملی صەد هەزار کەسیان پەڕاند، لە (ئەنتاکیا) ژیانیان لە دە هەزار کەس بڕی.

ئەوانە کە لە هێزی پێنجەمیان گەیشتە (استنبول) چواریەکی شارەکەیان سوتاندو دەستی کوشتنیان بۆ بەشێکی زۆر لە دانیشتوەکانی درێژکردو ئەوەی لە کەنیسەکانا هەبو هەمویان تالان کرد، لەگەڵ ئەوەی دانیشتوانی شارەکە هەمویان وەکو ئەوان دیان بون بەڵام مەزهەبیان جیاواز بو[٢].

جوستاف لۆبۆن دەڵێت صەلیبیەکان بڕیاریاندا کە دانیشتوەکانی (قودس) بنبڕ بکەن بە موسڵمانەکانیو جولەکەکانیو ئەو دیانانەی کە تیای بون کە لەسەر بیروباوەڕی ئەوان نەبون، ئەوانە لە ماوەی هەشت

١) مەصدەری پێشو.

٢) اسری الحرب عبر التاريخ (١٤٣,١٣١,١٣٠,١٤١)

ڕۆژ کەسیان تیا نەهێشت بەبێ‌ئەوەی ئافرەتێك یان منداڵێك یان پیاوێکی پیری لێ بەدەر بکەن، لە مزگەوتی (عومەرا) دە هەزار موسڵمانیان سەربڕی. ئەڵێت (ریکاردۆس قلب الاسد) سێ هەزار ئەسیری لە موسڵمانەکان کوشت کە خۆیان تەسلیم کرد، لەگەڵ ئەوەی پەیمانی دابونێ کە دەستی خەراپیان بۆ درێژ ناکات[1].

مسوڵمانەکان لە اسپانیا کە لە ساڵی ١٤٩٢ زایینی (غرناطە)ی پایتەختیان ڕو پێکردە مەلیکی أرغونە (فردنیاند) پەیمانیان لێ وەرگرت کە ژیانیان‌و ئاینیان‌و قسەو زوبانیان زامن بێت بەلاّم پاشی کاتێکی کەم دوچاری هەمو سەختێیك‌و ناخۆشێك کران بەخورتی بوبونە دیان‌و ڕویان تێکراو مەحکەمەی تەفتیش بریاری بە سوتاندنی بەشێکی زۆریان بە زوندوویەتی دا.

راهبی دمونیکی (بلیدا) بڕیاریدا ملی ئەوانەی لە ئایینی خۆیان وەرگەراون‌و بووبون بە دیان لەگەڵ ئەوانەی نەبوون بە دیان بپەرێندرێت، چونکە نازاندرێت ئەوانەی بوون بە دیان بونیان بە ڕاستییە یان نا .

دوایی بڕیار درا ئەو موسڵمانەی ماون ئەبێت بەرەو ئەفریقیا کۆچ بکەن، ئنجا کە کۆچ کردن دەستی پێکرد ڕێیان لە کۆچەرییەکان ئەگرت‌و تالاّنیان ئەکردن‌و ئەیانکوشتن.

(بلیدای راهب) صەد هەزار کەسی لە قافلەیێکا کە ژمارەیان (١٤٠) هەزار کەس بو کوشت[2].

* * * * * *

١) حضارة الاسلام (٣٢٦,٣٣٠ )

٢) حضارة الاسلام (٢٧٠-١٧١).

لە ساڵی ١٣٧٦ی زایینی پاپا لە ئیتالیا فەرمانێکی دەرێنا تیایا فلورەنسیەکانی لە قانون بە دەرچو دانا کە بیستی ئەمان ئەیانەوێت لە ڕای دەرچن، لەبەرئەمە بڕیاریدا ئەمان بە کۆیلە بگیـرێن‌و دەست بخرێتە سەر هەمو ماڵ‌و سامانێکیان. هێزێکی بە سەرۆکایەتی کاردینال (رۆبرت) ناردە سەریان. ئەم پەیمانی لێخۆشبونی دایە دانیشتوانی شاری (کارینا) بەڵان دوای ئەوەی دەستی بە سەریانا گرت گیانی لە هەمویان بڕی. ئەفسەرێك لە ئەفسەرەکانی لە شاری (فائندسا) چوار هەزار کەسی تیا سەربڕی[1].

لە ساڵی (١٣٧٠) (سیانبرۆس) کە شاری (لیسیۆن)ی داگیرکرد بڕیاریدا چاوی ئەسیرەکان هەڵبکۆڵدرێت‌و قاچیان ببڕدرێتەوە.

لە شەری (ئەکین کۆرت) لە ساڵی(١٤١٥) کە لە بەینی فەرەنساو ئینگلیزەکان ڕویدا، هێزی فەرەنسیەکان ڕویان کردە ئەسیری ئینگلیزەکان‌و دەستی ڕاستیانیان بڕییەوە.

* * * * * *

پرتوغالیەکان کە لە ساڵی١٤٦٠ لە ئەفریقیا (سیرالیۆنیان) داگیرکرد دەستیان بە ڕفاندن‌و ڕاوکردنی کۆیلە کرد، هەزاران کەسیان تیا بەرەو وڵاتەکانی خۆیان ڕەوانەکرد بۆ خزمەتکاری‌و کاری قورس‌و زەحمەت هێنانەدی.

ئەوانە کە لە هیندستان شاری (جوایان) داگیر کرد ئەفسەری لەشکرەکەیان خەبەری بە مەلیکی وڵاتی خۆی گەیاند کە لەم شارە ملی هەمو موسڵمانێکی پەراندووە. ئەم ئەفسەرە مزگەوتەکانی بە

---

١) اسری الحرب عبر التاریخ (١٤٢– ١٤٣).

موسلمانەکان پر ئەکردو ئاگری تێبەرئەدان[1].

ناپلیۆن وای دەرخست کە ئالای مافی مرۆڤایەتی هەلگرتوە لە سالی ١٧٩٩ دوای ئەوەی لە فەلەستین یافای داگیرکرد فەرمانی بە کوشتنی (٣٥٣٦) ئەسیردا، چونکە نەیتوانی بیاننێرێتە ولاتی میسر. تا لەوێوە بۆ ئەو جێیەی ئەیویست رەوانەیان بکات.

صربەکان بیست سالێك لەمە پێشتر لە بۆسنەو هەرسك رویان کردە مسولمانەکانو گیانیان لە هەزاران کەسیان بریو بیست هەزار ئافرەتی گەنجیان بە دیل گرت بۆ ئۆردوگایەکانیان رەوانەیان کردنو نازانـدرێت ئەوانە چیان بەسەر هات.

نزیکەی سەدو پەنجا سالێك لەمەوپێش لە ئەوروپا سیاسیە بەرێوەبەرەکان کە تەماشایان کرد زۆر بە نامەردیو نامروەتیو بە درندەیەتی لە هەمو لایێکی جیهان رو لە ئەسیر ئەکرێتو دوچاری ئازارو عەزێتی سەخت ئەکرێن، چەند کۆنگرە یێکیان بەست، وەکو کۆنگرەی برۆکسل لە سالی ١٨٧٤و کۆنگرەی جنێڤ لە سالی ١٩٢٩و کۆنگرەی جنێڤی دوەم لە سالی ١٩٤٩. بەشێك لە سەرۆکەکانی دەولەتەکان بەشداریان لەم کۆنگرەیە کردوە مۆریان کرد کە ئەبێت ئەسیر بە خراپە رووی تێنەکرێتو ژیانی بێئازاری بۆ برەخسێندرێت[2].

بەلان کاربەدەستانی هەمو ولاتەکانو ئەفسەرەکانیان تا ئێستا گوێیان بەو بریاردانە نەداوە، چونکە مرۆڤایەتی (انسانیەت) لە دلیانە هێزی نەبوەو بێهێزە، هەروەها ترسی خودایان لا نەبوەو لانیە، ئەگەر بوبێت لاواز بوەو ئەوەندە نەبوە تا لە روکردنە ستەمو خراپە بیانپارێزی.

---

١) اسری الحرب عبر التاریخ (١٥٩ –١٦١) .

٢) (القانون الدولـي العام)، بە قەلەمی (سەموحی فوق العادة) لاپەرە(٨٩)

ئەوانە نەك هەر بە دڕندایەتی رویان کردۆتە ئەسیر، بەڵکو بە هەمو خەراپییێك رویان کردۆتە دانیشتوانی بێگوناهی ئەو شارو دێهاتانەی کە کەوتبێتە سەر رێیان، بە تالانکردنی ماڵیانو دەستی خەراپە بۆ ئافرەتان درێژ کردنیانو سوتاندنی هەمو شێوە چەندراوێکیان.

لە جەنگی یەکەمی جیهانیدا ئەڵمانیا نزیکەی (٦١٥٩٠٠) ئەسیری لێ بزر بو، نەمساش ملیونێكو پێنج سەد هەزار ئەسیر، فەرەنساش (٤٨٣٣٠٠) ئەسیر، بەریتانیاش (٣٥٩١٠٠) ئەسیر ئیتالیاش (٥٦٩٠٠٠) ئەسیر، ئەمەریکاش (٤٧٦٥) ئەسیر، ئەسیری ڕوسەکانیش نزیکەی ملیۆنێكو نیو ئەسیر بو[1].

ئەو هەمو ئەسیرانە چیان لێ هات؟ هەمو کوشتنو ئازاردانو برسی بون روی تێکردنو گیانیان لێ سەندرا.

روسەکان لە جەنگی جیهانی دوەم بە هەمو خەراپییەك رویان کردە ئەسیرەکانی ئەڵمان، هەر وەکو ئەڵمانەکان لەوە پێش لەگەڵ ئەسیری ئەوان ئەمە پیشەو کردەوەیان بو.

ڕوسەکان کە بەسەر ئەڵمانەکان سەرکەوتنو چونە ناو بەرلین تیا هەمو کارێکی نارەواو بێمروەتیان هێنایەدی لە تالان کردنو کوشتنو دەستی دامێن پیسی بۆ ئافرەتان و وێرانکردنی ماڵان.

ئەوانە لە شەرێکا دەوری سەد هەزار سەربازی ئەڵمانیایان گرتو گیانیان لە هەمویان بری. سەرۆکی هێزەکەیان (کۆنییف) ئەڵێت: رێمان دایە سەربازەکانمان تا دەستی هەمو ئەو ئەسیرانە ببڕن کە بۆ تەسلیم بون هەڵیان بڕی بو، هەر ئەوە کردەوەیان بو لەگەڵ ئافرەتانو

---

١) اسری الحرب عبر التاریخ ( ١٩٩).

منداڵان و مرۆڤانی بێدەسەڵاتی پیر[1].

عەرەبەکانیش پێش هاتنی ئایینی ئیسلام و دوای هاتنیشی پێش ئەوەی بە ئیسلام بون شەرەفدا بێن و روناکییەکەی بکەوێتە ناو دڵیان، وەکو میللەتەکانی دیکە بە توندی و خراپی ڕویان ئەکردە ئەسیر، لە ئازاردان و کوشتن بە کۆیلە کردن.

ئەگەر یەکێك لە هۆزێك یەکێکی بگرتایە لە هۆزێکی دیکەی ناحەزیان، ئەگەر بیویستایە ئەیکوشت، یان بە کۆیلەی دەکردو ئەی فرۆشت.

وا ئەبو چەند کەسێك، لە تیرەیێك بە فێڵ یەکێك یان چەند کەسێکیان لە تیرەیەکی دیکە دەسگیر ئەکردو بە کۆیلەیان ئەگێڕان و ئەیانفرۆشتن بە تیرەێکی دیکەی کە ناخۆشی و دوژمنایەتیان لەگەڵ تیرەی ئەو بەدیل کراوانە هەبو بۆ ئەوەی قینی دڵی خۆیان پێیان دەربێنن بە ئازاردانیان و کوشتنیان.

دوای ئەوەی کە زانیمان کردەوەو رەوشتی میللەتانی پێشتر تا ئێستاکەش لە چ ڕاددە خراپێك بوە بەرامبەر ئەسیرو، ئنجا با بزانین ڕای ئایینی ئیسلام و پێغەمبەرﷺ چۆنەو چۆن بوە بەرامبەر ئەم شێوە مرۆڤانە.

با ئێستاکە ڕاو کردەوەیان دەربارەی ئەسیر بخەینە بەرچاو، دوایی روی قسەمان بکەینە ڕای ئیسلام دەربارەی کۆیلە تا بزانین ئەم ئایینە یاساو قانونی بۆ دەست بەسەر کۆیلە گرتن داناوە، یان بۆ دەست لەسەر بەردانیان و ئازادگرتنیان داناوە.

هەمو مێژو زانێك ئەزانێت یەکەمین شەڕ کە لە نێوان بت تپەرستەکانی مەککەو مسوڵمانەکان ڕویدا شەڕی بەدر بو، کە ژمارەی

١) اسری الحرب عبر التاريخ /٢٠٥-٢٠٦ .

ئەوان سێ جار بە قەد ژمارەی مسوڵمانەکان بوو بە هەمو چەکی خۆیان هاتبون‌و مسوڵمانەکانیش بۆ شەڕ نەهاتبون‌و چەکێکی کەمیان پێی بو، بەڵام خودای بەرزی بێ‌وێنە ویستی لەم شەڕەدا مسوڵمانەکان سەر بخات‌و لوتی بت پەرستەکان بشکێنێت، چونکە ئەگەر ئەوان سەر بکەوتنایە چرای ئاینی ئیسلام ئەکوژایەوەو هەڵگیرساندنی جارێکی دیکە زۆر زەحمەت ئەبوو نە ئەلوا.

لەم شەڕەدا بت پەرستەکان حەفتا کەسیان لێ کوژراو حەفتا کەسیشیان لێیان بە ئەسیر گیرا، ئنجا با بزانین داهاتوی ئەم ئەسیرانە بەچی گەیشت.

خودا خۆشی ڕۆژی دوایی بە چەند شتێك بەند کردوە، یەکێك لەم شتانە ئەوەیە کە یەکێك خواردن بۆ کەسانی هەژارو هەتیو و ئەسیر ئەڕەخسێنێت، لە سورەتی (الانسان) لە ئایەتی(٨،٩) ئەفەرموێت ﴿وَيُطْعِمُونَ الطَّعَامَ عَلَى حُبِّهِ مِسْكِينًا وَيَتِيمًا وَأَسِيرًا ۞ إِنَّمَا نُطْعِمُكُمْ لِوَجْهِ اللهِ لا نُرِيدُ مِنكُمْ جَزَاء وَلا شُكُورًا﴾[1] پێغەمبەر ﷺ فەرمانیدا کە ئەو ئەسیرانە بەسەر هاوڕێکانی دابەش بکرێن‌و فەرموی بەخۆشی لەگەڵیان بجوڵێنەوە خواردنیان بۆ جێبەجێ بکەن، یەکێك لەو ئەسیرانە کە ناوی ئەبوعەزیزی کوڕی عومەیر بو، وتویەتی من لەگەڵ بەشێك لە ئەنصارییەکان بوم کە کاتی خواردنی نیوەڕۆ و ئێوارە ئەهات نانەکەیان ئەدایە من خۆیان بە خورمای وشکەوە بو ئیدارەیان ئەکرد، چونکە پێغەمبەر فەرمانی دابو کە بەباشی ئاگاداریمان بکەن، ئەوانە

---

١) واتە: ڕەزامەندی خودا بۆ ئەوانەیە خواردن لەگەڵ ئەوەی خۆشەویستە ئەدەنە کەسانی هەژارو هەتیو ئەسیر، پێیان ئەڵێن بە بێ منەت خواردنتان ئەدەینێ، مەبەستمان ڕەزامەندی خودایە هیچ چاکەیەك و سوپاسێکمان لە ئێوە ناوێت .

ئەگەر پارچەیەك نانیان بكەوتایەتە ژێردەست بۆمنیان دائەنا،منیش لە شەرما ئەمگێڕایەوە بۆلای یەكێكیان، ئەویش هەر بۆمنی ئەگەڕاندەوە[1]

ثمامەی كوڕی ئەثال كە یەكێك بو لەو ئەسیرانە بەستیانەوە بە كۆڵەگەیەك لە كۆڵەگەكانی مزگەوتی مەدینە تا ڕا نەكات، پێغەمبەر فەرمانیدا خواردنی بۆ جێبەجێ بكەن، بەیانیان و ئێواران شیری حوشتری پێغەمبەری بۆ ئەهات.

ئەو ئەسیرانە دوای گفتوگۆ كە چیان لێبكەن كرانە سێ بەش بەشێكیان كە هەبوو خاوەنی سامان بون، ئەوانە بەرامبەر بەشێك لە ماڵدان بەردران، بەشێكیان كە خوێندەواربون ئازادكردنیان بەندكرا بەوەی كە هەریەكە دە منداڵ لە منداڵەكانی مسوڵمانەكان فێری خوێندنو نوسینو خوێندنەوە بكەن، بەشێكی دیكەیان كە هەژارو نەخوێندەوار بون پێغەمبەر ﷺ لێیان خۆش بوو فەرمانی بە ئازاد كردنیاندا.

پێغەمبەر ئەگەر بهاتایە فەرمانی بە كوشتنی هەمو ئەسیرەكانی شەڕی بەدر بدایە جێی ڕەخنە نەئەبو چونكە ئەوانە موجریمی شەڕ بون، وەكو ئەسیری شەڕی نیزامی نەبون كە بە خورتی بە پێی یاسای سەربازیەتی رویان پێ ئەكرێتە شەڕكردن، ئەگەر پێیان بكرێت لێی دور ئەكەونەوە. بەڵام ئەوانەی بەدر بە ئارەزوو هەوەسی خۆیان چەكیان كردە شانو هاتن بۆ بەدرو هەمو مەرامێكیان ئەوەبو پێغەمبەر بكوژنو مسوڵمانەكان بن بڕ بكەن.

پێغەمبەر ﷺ لە ئەسیرەكانی بەدر فەرمانی بە كوشتنی دو كەسدا یەكێكیان (نضری كوری حارث) بو ئەوەكەی تریان (عەقەبەی كوڕی ئەبی موعەیط) فەرمانی بە كوشتنی ئەم دوكەسەدا نەك لەبەر ئەوەی

---

[1]) آثار الحرب، (٣١٨) .

بەشدار بون لەم شەڕەدا بـەڵكو لەبـەر جەریمـەو كـردەوە خەراپـەكانی پێشانیانو ئازاردانی ئەو مرۆڤە بێهێزانەی كەلەكاتی خۆی مـسوڵمان بوبونو گەلێك خەراپەی تریان.

لە غەزای ئوحود فەرمانی بە كوشتنی عەززەی جومەحی دا كـە هـەر ئەم لەم غەزایەدا بە ئەسیر گیرابو. ئەو كابرایە شاعیر بو، لـە شـیعرەكانی ناوی پێغەمبەری بە خراپە ئەهێنا، هەوڵی ئەدا خەڵكی لە مسوڵمان بـون دوربخاتەوە. ئەمە لە شەڕی بەدرا بەشداربوو بو بـە ئەسـیر گیرابـو، لـەوێ پەنای بۆ پێغەمبەر بـرد بـۆ ئـەوەی لێـی خـۆش بێـتو ئـازادی بكـات، پێغەمبەر پێی فەرموو: عەفوت ئەكەم بەمەرجێك، جارێكی دیكە لـە هیچ شەڕێكا كە لـە نێـوان ئێمـەو دوژمنـەكانمان رو ئـەدات بەشـدار نەبیتو لەمە بەدوا ناوی ئیسلام بە خراپـە نـەبێنی، پـەیمانی لەسـەر ئەمە لێوەرگرت بەڵام كە ئازادكرا گەڕایـەوە مەككـە لـە شـیعرەكانیا ناوی پێغەمبەری بە خراپە ئەهێناو ئەوانەی لە شەڕی بەدرا كوژرابـون بۆیانی ئەلاواندەوەو مەدحیانی ئەكرد.

ئنجا لەم شەڕەیا كە بە ئەسیر گیرا هەمیسان داوای لێخۆش بونی لـە پێغەمبەر كرد، پێغەمبەر ﷺ پێی وت ئەو پەیمانەی كەوا دات كوا چی لێهات؟ نا، مرۆڤ لە كونێكەوە دوجار ناگەزرێتو پێوە نادرێت. كوشـتنی ئەم كابرایە لەبەر ئەو خیانەتەی بو.

ئەمە ئیتیفاقیەی جنێفی ساڵی ١٩٤٩ ڕێ بەمە ئەدا، ئـەڵێت ئـەو شێوە كەسانە كە لە پەیمانی خۆیان لا ئەدەنو بە هیچی دائەنێـــن دروستە بكوژرێنو لە قەنارە بدرێن.

پێغەمبەر ﷺ كە شاری مەككەی ئازاد كرد بە دانیشتوەكانی فەرموو ئایا ئێوە چۆن تێئەگەن كە من چیتان لـێئەكەم؟ وڵامیان دایـەوەو وتیـان

تۆ براێیکی خاوەن کەرەمی‌و کوڕی باوکێکی خاوەن کەرەمی، فەرموی بڕۆن هەمو سەرفرازو سەربەست بن. بەلأم فەرمانی بە کوشتنی چەند مرۆڤێك دا لەبەر ئەو خەراپانەی کە لەوەپێش لەگەڵ مسوڵمانەکان کردبویان و بە هەمو شێوەیەك عەزێت‌و ئازاردانیان، لەگەڵ ئەمەشا لە هەندێکیان خۆشبو، وەکو عیکرمەو سەفوان و هیند کە خێزانی ئەبو سوفیان بو، ئەگەر چی گەلێك تاوان باربو.

ئەم ژنە بت پەرستەکانی هان ئەدا بۆ شەڕی ئوحودو ئازادکردنی کۆیلەکەی کە ناوی (وەحشی) بوو تیرهاوێژێکی زۆر ماهر بو، بە کوشتنی (حەمزە)ی مامی پێغەمبەر بەندکرد، ئنجا کە حەمزە شەهید کرا، هیند جەرگی دەرێناو دەستی کرد بە جواندنی پارچەیەکی، گوێی چەند شەهیدێکی بڕی‌وکردیە ملوانکە بە ملی خۆی کرد.

لەوانەی کە فەرمانی بە کوشتنیان دابو تەنیا فەرمانی کوشتنی چوار کەسیان دا کە زۆر بەدرەوشت‌و خراپ بون، دوانیان لە مەدینە مسوڵمان بون‌و دو مرۆڤیان لە مەدینە کوشتبوو بەرەو مەککە ڕایان کردبوو لە ئاین وەرگەڕابون.

مامۆستایانی بەرزی پێشتر بڕیاریان داوە کە ئەسیر لەبەرئەوەی ئەسیرە دروست نیە روی کوشتنی تێبکرێت، حەسەنی کوڕی موحەمەدی تەمیمی کە لە ساڵی٦٥٦ی کۆچی سەری بردۆتە ژێرخاك ئەڵێت: ئەمە هەمو یارەکانی پێغەمبەر ﷺ بڕیاریان لەسەر داوە کەواتە ئیجماعیان لەسەر کردوە، ئەمە ئیمامی سیوطی لە ئەحکامی قورئانیا دیاری کردوە[1]. ئەسیر ئەگەر لە شەڕکردنیا لە سنوری شەڕکردن دەرنەچێت

---

١) تەفسیری روح المعانی، نوسینی زانای بەرز ئالوسی، ( ٢٦/ ٢٠٠).

دروست نیە بکوژرێت، بەڵام ئەگەر لەو سنورە دەرچو، وەکو کوشتنی بێگوناهان، یان دەستی خراپە بۆ ئافرەتان درێژکردن، یان بە تالانکردنی ماڵی خەڵك ئەوە بە موجرمی شەڕ دائەندرێتو دروستە بە فەرمانی سەرۆکی وڵات، یان بە فەرمانی یارمەتی دەرەکەی بکوژرێت، ئەو فەرمانە لەو دوانە زیاتر بۆ هیچ کەسێکی دیکە نییە.

قورئانی پیرۆز لە ئایەتی چوار لە سورەتی محمد ئەفەرموێت: ﴿فَإِذا لَقِيتُمُ الَّذِينَ كَفَرُوا فَضَرْبَ الرِّقَابِ حَتَّى إِذَا أَثْخَنتُمُوهُمْ فَشُدُّوا الْوَثَاقَ فَإِمَّا مَنًّا بَعْدُ وَإِمَّا فِدَاء حَتَّى تَضَعَ الْحَرْبُ أَوْزَارَهَا﴾ فەرمایشت ئەفەرموێت، ئەگەر لە شەڕا یەکیان لەگەڵ دوژمنە کافرەکانتان گرت ڕەشیدی بنوێننو بە هەمو تواناییێك هەڵمەتیان بەرنە سەرو چەکیان لێبوەشێنن تا تواناکیان کز ئەکەن و بە ئەسیری دەسگیریان ئەکەن، ئەو کاتە بیان بەستنەوە تا ڕانەکەن [1]، ئنجا کە شەڕ کۆتاییی پێدێت بە پێی بەرژەوەندی، یان بە پارە سەرفرازیان بکەن یان بە ئەسیری خۆتان کە لای ئەوانن بیانگۆڕنەوە، یان هەر بەبێ شتێك دەستان لەسەریان هەڵگرنو ئازادیان بکەن.

ئێمە لەمە پێشتر زانیمان پێغەمبەر ﷺ بە ماڵ بەشێك لە ئەسیرەکانی بەدری سەرفراز کرد.

جارێکیش مرۆڤێکی ئەسیری بت پەرستی بەدو ئەسیری مسوڵمان گۆڕییەوەو ئافرەتێکی لە خێڵی فەزارە بە چەند کەسێك لە مسوڵمانەکان گۆڕییەوە کە لە مەککە ئەسیر بون [2].

گۆڕینەوەی ئەسیری ڕۆمەکان لەگەڵ ئەسیری مسوڵمانەکان لەکاتی

---

1) لەو کاتەدا ئەسیر کەم بون بۆیی جێگای تایبەتیان بۆ تەرخان نەکرابو.
2) شەرحی صەحیحی موسلم ( ١٢/٦٨) .

ئەمەوییەکانو عەباسیەکانو لەکاتی حوکمی ئیسلامی لە ئەندەلوس، مێژو نوسەرەکان لە کتێبەکانیان دیارو ئاشکرا کردوە.

پێغەمبەر ﷺ هەروەکو زانیمان بەشێك لە ئەسیرەکانی بەدری هەروەها ئازادکردن، هەروەکو کچی حاتەمی طائی کە ئەسیر کرابو بە قەدرگرتن ئازاد کردو ڕەوانەی جێگا خۆی کرد[1]، هەروەها دوای غەزای حونەین و طائف هەمو ئەسیرەکانی هەوازنی ئازاد کرد.

سەلاحەددینی ئەییوبی لە شەڕێکا لەگەڵ صەلیبیەکان بەشێکی لێیان بە ئەسیر گرت، بەڵام لەبەر ئەوەی ئەوەندە خواردەمەنییەی لەبەردەست نەبو کە بەشیان بکات هەمویانی ئازاد کرد. بەڵام ئەو نامەردانە لە خۆیان لەشکرێکیان پێك هێناو جارێکی دیکە لەگەڵیا کەوتنە شەڕکردن[2] .

سەلاحەددین زۆر جار نەك هەر سەربازەکانی دوژمنی ئازاد ئەکرد، بەڵکو ئەفسەرەکانو سەرۆکی لەشکریانیشی ئازاد ئەکرد کە بە ئەسیری ئەکەوتنە بەردەستی، تەنیا (ردینۆدی شاتیۆن)ی کوشت، چونکە پشتی کردە هەمو پەیمانێکی کە خۆی پێ بەند کردبوو لەشکرێکی ڕێك خست بۆ ئازارگەیاندن لە کەناری دەریای سور بە کۆمەڵی حاجیەکان کە ئەچون بۆ مەککە یان کە ئەگەڕانەوە[3].

سەلاحەددین رجای مەلیکە (ایزابیلا)ی وەرگرتو دەستی لەسەر هەمو ئەو ئەسیرانە هەڵگرت کە ئەو رجایە ئەیویست، تا بگەڕێنەوە لای خێزانوماڵو مناڵەکانیان.

---

١) آثـار الحرب .

٢) اسرى الحرب ١٩ .

٣) صلاح الدين الايبوبي، نوسينى قەدرى قەعەجى، ٧٣ – ٧٨ .

ئەم مرۆڤە بەرزە بە ئیمان دڵ ڕوناکە کە دەوری صەلیبیەکانی لە قودس گرت، ئەوان داوای ئەمانیان کرد، ئەم ئەمانی دانێ تا لە ماوەی چل ڕۆژ کۆچ بکەنو هەر مرۆڤێك دە دینار بداتو، هەر ئافرەتێك (٥) دینار بداتو هەر منداڵێك (٢) دینار، لەگەڵ ئەمەشا ڕێی دەرچونی بەشێکی زۆری دا بەبێ هیچ پارەیێك، ڕێی بە هەمویان دا ئەوەی ئەتوانن لە ماڵیان لەگەڵ خۆیان ببەن، پارەو ولاغیشی بۆ نەخۆشەکانیانو پیرەکانیانو ئافرەتەکانیان دابین کرد[1].

هەروەکو وتمان ئەسیر بە پێی ئایینی ئیسلامی دروست نیە بکوژرێت ئەگەر لە شەڕا لە سنوری شەڕکردن لانەدات خەراپە نەنوێنێ، وەکو تالآن کردنو دەست بۆ ئافرەتان درێژکردنو هەروەکو لەمەو پێش ئاماژەمان بۆی کرد.

ئەنجا ئەگەر لە درێژایی حوکمی ئیسلامی پاشێك یان سەرۆکی لەشکرێك دەستی کوشتنی بۆ. ئەسیرێك یا چەند ئەسیرێك درێژ کردبێ کە لە سنوری شەڕکردن لایان نەدابێت، ئەوە ئەو کەسە تاوانبارەو لە دوارۆژ ئەکەوێتە ژێر حیسابو لێپرسینەوە، ئایینی ئیسلام لەم شێوە کردەوانە ئەگەر رویدابێت لێی بەرپرس نیە.

لەگەڵ ئەمەشا ئەبێت بزانین زۆر شت لەم روەوە کە خرابێتە سەر کاغەز هەڵبەستراوەو درۆیە دوژمنانی ئایینی ئیسلام هەڵیان بەستوەو ڕازاندویانەتەوە.

لەم روەوە لەوانەی کە خراوەتەوە سەر کاغەز وتراوە (سوڵتان محەمەد فاتحی عوسمانی) کە وڵاتی میسری داگیر کردو خستیە ژێر باڵی خەلافەتی

---

[1] صلاح الدين الايبوبي، ٨٣ .

عوسمانی پەنجا هەزار کەسی لە مەمالیکەکان کوشت لەگەڵ ئەوەی پەیمانی دابونێ کە دەست بۆ ماڵو گیانیان درێژ ناکات، بەبێ ئەوەی خاوەنی ئەو وتارە بزانێت کە داگیرکردنی میسر دوای مردنی ئەم سوڵتانە بە سەد ساڵ هاتەدیو لە کاتی سوڵتان سولێمان ڕویدا کە دواترین خەلیفەی عەبباسیەکان (المتوکل) لە نزیکەی ساڵی (١٥١٧)ی زایینی جێگای خۆی بۆ ئەم چۆل کردو دەستی لەسەر خەلافەت بەرداوە.

دواتر ئەڵێم: ئەو کەم کوشتنە ئەسیرانەی کە لە لایەن خەلیفەیێك لەکاتی ئەمەوییەکان، یان لەکاتی عەبباسیەکان، یان لە لایەن سەرۆکی هێزی لەشکرێك کە ڕوی کردبێتە ئەسیرێك یان چەند ئەسیرێك رونی ئاسمانی شەڕەکانی مسوڵمانەکان شێلو ناکاتو عەیبە روی تێناکات ئەگەر بەراورد بکرێت بەو کوشتارانەی کە بە کۆمەڵ روی پێکراوەتە ئەسیر لە لایەن مالیکەکان کوشت هەمو دەوڵەتەکان بە درێژایی مێژو لە کۆنەوە تاوەکو ئەم چەرخەی ئێستاکەمان، کە لەمە پێشتر هەندێکیانمان خستە بەرچاو کە لەگەڵ ئەوەی پەیمانی دابونێ کە دەست بۆ مێژو بە شەرمو خەجالەتەوە باسی ئەکات.

# کۆیـلایەتی و ئایـینی ئیسـلام

ڕەخنەیەکی پوچەڵی دیکە کە لە ئایین وەرگەڕاوەکان ڕوی پێ ئەکەنە ئایینی ئیسلامو کاوێژی ئەکەن ئەوەیە کە ئەڵێن ئایینی ئیسلام ڕێی داوە مرۆڤ بە کۆیلە بگیردرێت ئەگەر ئەم ئایینە ئاینێکی ڕاستو تەواو بوایە ئەبو دەست بەسەر کۆیلە گرتنی لەناو وڵاتو کۆمەڵا قەدەغە بکردایەو ڕێی پێ نەدایایا.

ئنجا با بزانین پوچەڵی ئەم ڕەخنەیە لە چ ڕادەیێکەو ئایا نرخو سەنگێکی هەیە؟

بونی کۆیلایەتیو دەست بەسەر کۆیلە یا گرتن کۆنە بە کۆنی مێژو، ئەمە لەناو هەمو میللەتێکا ڕوی داوەو هاتۆتە دی. ئەوانەی بە کۆیلە ئەگیران مافی ئادەمیزادیان لێ ئەبڕدراو بە هەمو شێوە خەراپیو ئازارو ناخۆشیەك ڕویان تێئەکرا.

کۆیلە لە لای ڕۆمانیەکان بە مرۆڤ نە ئەژماردرا، بە بەشێك تەماشا ئەکرا وەکو شتەکانی دیکەو بێبەش لە هەمو مافێکی مرۆڤایەتی. خاوەن تواناو ئەشرافەکانیان کۆیلەکانیان بەڕۆژ پابەند ئەکردو بە قامچی بەرەو زەویەکانیان و باغەکانیان ڕایان ئەدان و ڕویان پێیان ئەکردە ڕەخساندنی ئەو کارانەی کە ئەیانەویست، ئەوەی لە کاریا سستێکی لێ ڕوبدایە دارکاری ڕوی تێئەکردو بەر سزادان ئەکەوت.

خاوەنانی هەر بەشە کۆیلەیێك مافی ئەوەیان هەبو دەستی ئازاردانو کوشتن بۆ هەر کۆیلەیێك بیانەوێت درێژ بکەن بەبێ ئەوەی یاسایێك ڕێیان لێبگریتو بکەونە ژێر لێپرسینەوەیێك.

ئەو ئەشرافانە بۆ ڕابواردنو کەیفو سەفای خۆیان جێگای تایبەتیان

تەرخان کردبو تیاگرد ئەبونەوە بۆ ئەوەی لە ڕۆژێکدا چەند جارێك دو کۆیلە بەرەنگاری یەکتری بکەن‌و بە شمشێر یان بە ڕم روبکەنە یەکتری، ئنجا ئەوەی بە هەڵپەتر بوایەو بەسەر ئەوەکەی تر زاڵ ببوایە گیانی لێوەربگرتایە، ئەبوە فیکە لێدان‌و چەپڵەڕێزان. وا ئەبو هەندێك جار ئیمپراتۆریش پێکی لەو کۆبونەوەیە کرد.

مامەڵەی هیندیەکان‌و ئێرانیەکان لە خەراپیا لەگەڵ کۆیلەکانیان جیاوازییەکی زۆری نەبو لەگەڵ مامەڵەی رۆمانیەکان لەگەڵ کۆیلەکانیان[1].

کۆیلە لە هەمو کاتێك لە لایەن هەمو میللەتێك و دەوڵەتێك زۆر بە سوکی و بە بێ‌نرخی تەماشا ئەکراو هێنانەدی کاری سەخت و قورسی پێ ئەسپێردراو ئەوەندە خواردنەی پێئەدرا تا بۆ بەکارهێنان بژێت.

لەوەی رابرد دەرئەکەوێت پێش ئەوەی ئایینی ئیسلام بێت کۆیلە خستنە ژێردەست کارێکی باوبوە لە هەمو لایەکی ئەم جیهانەو لایێك بو لە لایەکانی ئابوری لە هەمو شوێنێك بازاڕی گەرمی هەبو، لە چەند رووێیکەوە روی تێئەکراو ئەهاتەدی وەکو ڕفاندنی بێ‌دەسەڵاتان لە منداڵ و مرۆڤ و ئافرەت.

وا ئەبو بۆ تاڵان‌و کۆیلە دەستکەوتن هۆزێك بەسەر هۆزێکی دیکەی ئەدا، ئەو گەنجانەی بکەوتایەتە ژێردەست لە نێرو مێ بەدیل ئەگیران‌و پەردەی کۆیلایەتیان بەسەرا ئەدراو لە لایێك ئەفرۆشران، ئەمە جگە لەوانەی لە شەڕا لە نێوان دوو میللەت‌و دوو دەوڵەتا بە دیل ئەگیراو کۆیلایەتی بەسەر ئەدرا.

---

١) شبهات حول الاسلام، نوسینی محەمەد قطب، لاپەڕەی ( ٣٩- ٤٠) .

ئایینی ئیسلام کە هات نەئەکرا هەروا بەئاسانی بەگژ ئەم کارەیا بچێتو ڕوتێکردنی بە حەرام لە قەڵەم بداتو لەناو کۆمەڵو وڵاتا بنبڕی بکات، بەڵام هەمو ڕێیەکی لە ڕێیەکانی بڕی تەنیا ڕێی جەنگ نەبێت.

چونکە نە ئەبو دوژمنەکانیان لە شەڕکردنا ئەگەر دیلیان لە مان بگرتایەو کۆیلایەتیان بۆیان بڕیار بدایە، ئەمان پەردەی کۆیلایەتیان بە سەر ئەسیرەکانی ئەوان نەدابایەو هەروەها ئازادیان بکردنایە، بەڵکو ڕێكو پێویست وای ئەخوازی ئەمان بە پێی جولانەوەی دوژمنەکانیان لەگەڵیان بجولێنەوەو ئەمانیش کۆیلە لەوان بگرن تاوەکو بە دیلو کۆیلەی خۆیان لای دوژمنەکانیان بیانگۆڕنەوەو لە دیلایەتیو کۆیلایەتی ڕزگاریان بکەن.

ئاینی ئیسلام هەر وەکو هەمو سەرچاوەیەکی کۆیلە ژێردەستکردنی بڕیو بە حەرامی دانا تەنیا لە ڕێگەی شەڕکردن نەبێت لەگەڵ دوژمن، هەروەها هەمو کردەوەییکی کە لە شەڕاو دوای شەڕ روی تێئەکران بڕیو بە حەرامو ستەمی داناو، کۆیلە کوشتنو دەستی خراپە بۆ ئافرەت درێژکردنو ڕوخاندنی ماڵانو ئاگر تێبەردانیو ماڵان تاڵان کردنو[1] کوشتنی کەسانی بێگوناهی بەشدار نەبو لە شەڕا لە پیاو منداڵانو ئافرەتان.

فەرمایشتی پێغەمبەرو ﷺ فەرمانی خەلیفەکان بە قەدەغەکردنی ئەم کارانە دیارو ئاشکرایە لەلایەن مێژو مێژوزانەکانو مێژو نوسەرەکان.

خەلیفەی یەکەم ئەبوبەکر– خودا لە بەهەشتا پلەی بەرزبکاتەوە–

---

١) تاڵانێك کە دروست بێت هەر ئەوەیە کە لە مەیدانی شەڕا لە دوژمن دەسگیر ئەکرێتو ئەوەی دوای شەڕ لێی بەجێ ئەمێنێت، نەك ڕوکردنە ماڵانو تاڵانکردنی.

بە سەرۆكی ئەو لەشكرەی روی پێ‌كردە ولاتی شام وتی وەكو یزیدی كوڕی ئەبوسفیان‌و عەمری كوڕی عاص‌و شورەحبیلی كوڕی حەسەنە، دەست بۆ منالان‌و پیاوانی پیرو ئافرەتان درێژ مەكەن، هەندێ كەس ئەبینن لە كەنیسەكان خۆیان تەرخانكردوە بۆ خوداپەرستن، ئەوانە ناكوژرێن‌و دەستی خراپەیان بۆ درێژمەكەن، چونكە خەراپەیان لێ‌رونادات، ئەوانە بەو كافریەی كە لەسەرین دروست نیە روی خەراپەو ناخۆشیان تێبكەن[1]

لەمە پێشتر زانیمان كۆیلە لە لای میللەتانی پێشو بە چ چاوێكی بێ‌نرخ تەمەشا ئەكراو ئازار ئەدراو روی پێ ئەكرایە هێنانەدی كاری عەزێت‌و ناخۆش، ئاایینی ئیسلام بە پێچەوانەی ئەمە فەرمان ئەدات كە ئەبێت كۆیلە بە چاوی بەزەیی پێهاتن تەماشا بكرێت‌و بە جوانی لەگەڵیا هەڵس‌وكەوت بكرێت.

پێغەمبەر ﷺ ئەفەرموێت: هەر كەسێك كۆیلەی خۆی بكوژێت لە جیاتی ئەو ئەیكوژین، هەر كەسێكیش لوتی ببڕێت لوتی ئەبڕین، فەرمویەتی كۆیلەكانتان براتانن، هەركەسێك كۆیلەی لابێت، لەوەی خۆی ئەیخوات دەرخواردی بدات‌و لەوەی خۆی لە جل‌و بەرگ لەبەری ئەكات لەوە لەبەر ئەویش بكات‌و كاری وایان پێ مەسپێرن كە لە توانایان نەبێت‌و عەزێتیان بدات، ئەی فەرموو كەس بە كۆیلەی خۆی نەڵێت چ پیاو بێت یان ئافرەت ئەمە كۆیلەمەو ئەمە كەنیزەكە، با بڵێت ئەمە كوڕمەو ئەمە كچمە، ئەی فەرموو ئێوە هەمو گەورەبێت یان گچكە –نێر بێت یان مێ كۆیلە بێت یان ئازاد – نەتەوەی ئادەمن ئادەمیش لە گڵە.

خودای بەرزی بێوێنە لە ئایەتی(٣٦) لە سورەتی نیساء فەرمانمان

---

١) المهذب، هی ئەبو ئیسحاقی شیرازی، ٢/٢٣٤ .

پێ ئەكات كە ئەبێت بە چاكەو خۆشی رو لە چەند كۆمەڵێك بكەین، بەشێك لەوانە باوكو دایكە، بەشێكی كەیان كۆیلەكانن. ئەفەرموێت: ﴿وَاعْبُدُواْ اللهَ وَلاَ تُشْرِكُواْ بِهِ شَيْئًا وَبِالْوَالِدَيْنِ إِحْسَانًا... وَمَا مَلَكَتْ أَيْمَانُكُمْ ...﴾، واتە: بەندایەتی خودا بكەنو بە باشی بیپەرستن وێنەی بۆ دامەنێن، خودا تاكو تەنهایە، بە چاو جوانیو خۆشی ڕو لە دایكو باوكتان بكەن، هەروەها لەو كۆیلانەی دەستتان بە سەریانەوەیە.

كۆیلە ئازاردان بە پێی یاسای ئیسلامی دروست نیەو گوناهە لە دوا ڕۆژا پرسینەوەو سزای بە دواوەیە، ئەوەی بەبێ هۆكارێكو گوناهێك شەقازیلەیەك لە كۆیلەی خۆی بدات ئەو كارەی ئەبێتە هۆی ئازادبونی كۆیلەكەی.



بە خۆشی بە جوانی مامەڵەكردنی مسوڵمانەكانی پێشوو یارەكانی پێغەمبەر لەگەڵ كۆیلەكانیان لە ڕاددەیێكا بو كەوا ئەبو هەندێك لە كۆیلەكان نەیانئەویست لە لایەن دەست بەسەرەكانیان ئازاد بكرێنو لێیان جیاببنەوە.

پێغەمبەر ﷺ پێش ئەوەی بە پێغەمبەرایەتی شەرەفدار بكرێت خەدیجەی خێزانی زەیدی كوڕی حاریثە كە كۆیلەی ئەو بو بە هەدییە دایێ، پێغەمبەر بە كۆیلایەتی تەماشای نەئەكرد بەڵكو وەكو كوڕی خۆی تەماشای ئەكردو لەگەڵی هەڵئەستاو دائەنیشت. لەبەر ئەمە زەید پێیەوە بەند بوبو نەیئەویست هیچ كاتێك لێی جیاببێتەوە.

باوكی زەیدو مامیو چەند خزمێكی دیكەی كە زانیان زەید كۆیلەیە لای محەمەد، هاتنە لای پێیان وت، ئێوە خانەدانو خاوەنی جێگاو ڕێگەن، تۆ چیت ئەوێت لە ماڵ پێشكەشتی ئەكەین زەیدمان بۆ ئازاد بكە تا بیبەینەوە بۆ لای خۆمان.

پێغەمبەر پێیانی وت، ئێوە زەید بدوێنن ئەگەر ویستی لەگەڵتان بگەڕێتەوە من بەبێ ئەوەی شتێکتان لێ وەربگرم بیبەنەوە، وتیان جوانت فەرمو ئنجا کە قسەیان لەگەڵ زەید کرد، وتی: من ناگەڕێمەوەو ئەم پیاوە بەجێ نایڵم، وتیان ماڵ وێران کۆیلایەتیت پێ خۆشترە لە ئازاد بون؟

وەڵامیانی دایەوە وتی ئەوەی لەم پیاوەم دیوە لە لوتفو خۆشیو خۆشەویستن لای کەس وکاری خۆم نەم دیوە.

پێغەمبەر کە ئەمەی لە زەید بیست لەگەڵ کەس و کارەکەی بردیە کەعبەو لەوێ ئازادی کردو بە کوڕی خۆی گێڕا، پێش ئەوەی کەسێك بە کوڕی کەسێکی دیکە زانین حەرام بکرێت.

ئایینی ئیسلام یاسای بۆ دەست بەسەر کۆیلە گرتن دانەناوە، لەم ڕوەوە هیچ ئایەتێك لە قورئانو لە فەرمایشتەکانی پێغەمبەردا نیە، بەڵکو ڕێ نیشاندان بۆ چاکەو خێر دەست کەوتن بە ئازادکردنیو وردە وردە لابردنیو نەهێشتنی لەناو کۆمەڵدا لە هەردو فەرمایشدا گەلێك بەڵگە هەن.

١- پێغەمبەر ﷺ زۆرجار هانی یارەکانی ئەدا بۆ کۆیلە ئازادکردن، و لێخۆش بونی خودای لە هەندێك گوناه بەند ئەکرد بۆ بە ڕو کردنە ئەم ئازادکردنە، ئەو یارانە ئەوەی بۆی بلوابایەو بیتوانایە لەم ڕوەوە درێغی نە ئەکرد. جەنابی ئەبوبەکر خودا لە بەهەشت پلەی بەرزبکاتەوە، بەشێکی زۆری لە ماڵی خۆی خەرج ئەکرد بۆ کۆیلە کڕینو ئازادکردنیان، کە یەکێکیان بیلالی حەبەشی بو.

٢- هەر مسوڵمانێك بە هەڵەو بە نەزانین مسوڵمانێك بکوژێت سزاکەی کۆیلەیەکی مسوڵمان ئازادکردنەو دانی خوێنی کوژراوەکەیە

ئەبێت بدرێتە کەسوکارەکەی کە میراتیان بەر ئەکەوێت: خودای بەرزی بێوێنە لە سورەتی (النساء) ئایەتی (٩٢) ئەفەرموێت: ﴿...وَمَن قَتَلَ مُؤْمِنًا خَطَئًا فَتَحْرِيرُ رَقَبَةٍ مُّؤْمِنَةٍ وَدِيَةٌ مُّسَلَّمَةٌ إِلَى أَهْلِهِ...﴾.

٣- هەر کەسێك سوێند بە خودا یان بە سیفەتێکی خودا بخوات کە کارێك ناکات دوایی بیکات، وەکو ئەوەی سوێند بخوات بڵێت ئەم خانوە ناکڕم، دوایی بیکڕێت کەفارەی سوێندەکەی کە شکاندویەتی چەند کارێکە، یەکێك لەم کارانە ئازاد کرەنی کۆیلەیێکە. خودا لە سورەتی مائیدە ئەفەرموێت: ﴿لاَ يُؤَاخِذُكُمُ اللهُ بِاللَّغْوِ فِي أَيْمَانِكُمْ وَلَكِن يُؤَاخِذُكُم بِمَا عَقَّدتُّمُ الأَيْمَانَ فَكَفَّارَتُهُ ... أَوْ تَحْرِيرُ رَقَبَةٍ ...﴾.

٤- عەرەبەکان پێشان ئەگەر یەکێکیان لە هاوسەرەکەی خۆی توڕە ببوایە، وا ئەبو ئەیشوبهاند بە لاێیکی دایکی خۆی، وەکو ئەوەی بڵێت تۆ وەکو پشتی دایکمی، یان وەکو زگی، یان نەیشوبهان بە لاێیکی کچی یان خوشکی. ئنجا ئەو ئافرەتەی لێ حەرام ئەبو، نە بە هاوسەر ئەناسرا، نە بە تەلاَقدراو تا بتوانێت بۆ خۆی شوێکی دیکە بکات. ئنجا بۆ ئەوەی بتوانێت ئافرەتەکە بخاتەوە ژێربالی خۆیو لێی حەلاَلْ بێت، خوا لە سێ کار هێنانەدی کارێکی لە سەر بە پێویست دائەنێت، کە یەکێکیان کۆیلەیێك ئازاد کردنە، لە ئایەتی (٣) لە سورەتی (المجادلة) ئەفەرموێت: ﴿وَالَّذِينَ يُظَاهِرُونَ مِن نِّسَائِهِمْ ثُمَّ يَعُودُونَ لِمَا قَالُوا فَتَحْرِيرُ رَقَبَةٍ مِّن قَبْلِ أَن يَتَمَاسَّا ...﴾.

٥- خودا هەمو ساڵێك زەکاتدانی لەسەر مسوڵمانە هەبوەکان بە پێویست داناوە، بەو شێوەیەی لە کتێبە شەرعیەکان دیارکراوە، ئنجا ئەو ماڵەی لە زەکات دێتە دەست بە پێی پێویست روی پێنەکرێتە هەشت بەش بەشێك لەو بەشانە کۆیلە کڕینو ئازاد کردنیانە، تاوەکو

کۆیلە لەناو کۆمەڵا کەم ببێتو وردە وردە ڕو لە نەمان بکات. خـودا لە ئایەتی (٦٠) لە سورەتی (التوبة) ئەفەرموێت: ﴿إِنَّمَا الصَّدَقَاتُ لِلْفُقَرَاءِ وَالْمَسَاكِينِ .... وَفِي الرِّقَابِ....﴾ مەبەست لـە (وفي رقـاب) کۆیلە کڕینو ئازادکردنیانە.

عومەری کوڕی عەبدولعەزیز خەلیفـەیێك بـو لـە خەلیفـەکانی ئەمەوییـەکان، ئـەم خەلیفەیـە زۆر دادوەرو خواناسـێکی تـەواوبو، یەحیای کوڕی سەعدی ناردە سەروی وڵاتانی ئەفریقا بۆ ئەوەی پـارەی زەکـات کۆبکاتـەوە، دوای گردکردنـەوە، پـارەیێکی زۆری کەوتـە ژێردەست، بەشێکی زۆری بەسەر هەژاران دابەش کرد، بەشەکەی تری کە تەواوێك بو بە پێی ڕێ نیشاندانی خەلیفە بەشـێك کۆیلـەی پـێ کڕیو ئازادی کردن.

٦- (ايلاء) ئیلاء سوێند خواردنە، بەڵام سوێند خـواردنێکی تایبەتیـە. عەرەبەکان پـێش ئـەوەی ئـایینی ئیـسلام بێـت ئەگـەر یـەکێك لـە هاوسەرەکەی تورە ببوایەو حەزی لێنەکردایەو بیویستایە ئازاری بدات سوێندی ئەخوارد کە لەگەڵی نانوێتو لەگەڵی جوت نابێت بـۆ ئـەو مـاوەیەی کە داینەنا، جاروابو لە ساڵێك زیاتر تێئەپەڕی، ئنجـا ئـەو ژنە هەروا ئەمایەوە نە بە هاوسەر ئـەژمێردرا نـە بـە تەڵاقـدراو تـا بتوانێت شو بە یەکێکی کە بکات.

ئایینی ئیسلام کە هات بۆ چارەسەرکردنی ئەم گرفتە ئەو مـاوەیەی بە چوار مـانگ بڕیاردا، ئەگـەر لەوماوەیـە ڕوی تێنـەکردو لەگـەڵی نەخەوت بەینی لەگەڵی ئەپـچڕێتو تـەڵاقی ئەکـەوێت بـە تـەڵاقی بائینەی گچکە. خودا لە سورەتی (البقرة) لـە ئایـەتی(٢٢٦، ٢٢٧) ئەفەرموێت ﴿لِّلَّذِينَ يُؤْلُونَ مِن نِّسَآئِهِمْ تَرَبُّصُ أَرْبَعَةِ أَشْهُرٍ فَإِنْ فَآؤُوا فَإِنْ

اللهَ غَفُورٌ رَّحِيمٌ ۞وَإِنْ عَزَمُواْ الطَّلاَقَ فَإِنَّ اللهَ سَمِيعٌ عَلِيمٌ﴾، بەلام ئەگەر پێش تەواوبونی ئەو ماوەیە روی کردە هاوسەرەکەی و لەگەڵی خەوت ئەوا ژن و مێردایەتیان وەکو جاران ئەمێنێت، بەلام ئەبێت کەفارەی سوێندەکەی بدات کە کەفارەێکیان کۆیلەیێك ئازاد کردنە، هەروەکو لە خاڵی سێیەم خستمانە بەرچاو.

باسی ئیلاء باسێکی درێژەو لای مەزهەبەکان لق و پۆی زۆرە، مەبەستم لێرە دەرخستنی حوکمەکەیەتی کە ئازادکردنی کۆیلەیە.

٧- کۆیلەیەك ئەگەر ئارەزوی ئازاد بونی کرد بەلام دەست بە سەرگرتوەکەی نەیویست ئازادی بکات، کۆیلەکە بۆی هەیە داوای لێبکات رێی بدات بچێت ئیش بکات، بۆ ئەوەی هەندێك پارە ژێر دەست بکات و بەو پارەیە خۆی لەکابرا بکرێت و لە دیلایەتی رزگاری ببێت، ئەگەر رێی نەدات و کۆیلە پەنای بۆ قازی برد، قازی بەخورتی ئەو رێیەی بۆ دێنێتە دی.

دیلەکە ئەگەر لەگەڵ دەست بەسەر گرتوەکەیا لەسەر بەشێك پارە بۆ ئازادکردنی رێککەوت، مامۆستایانی شەریعەت ئەڵێن ئەبێت کابرا هەندیك لەو پارەیە داشکێنێ و لێی وەرنەگرێت، هەروەکو پێویستە لە خەزێنەی دەوڵەت (بيت المال) هەندێکی بدرێتێ تا لەگەڵ ئەوەی بە ئیش کردن پەیدای ئەکات خۆی لە دیلایەتی رزگار ئەکات.

خودای میهرەبان لە ئایەتی (٣٣) لە سورەتی (نور) ئەفەرموێت:
﴿...وَالَّذِينَ يَبْتَغُونَ الْكِتَابَ مِمَّا مَلَكَتْ أَيْمَانُكُمْ فَكَاتِبُوهُمْ إِنْ عَلِمْتُمْ فِيهِمْ خَيْرًا وَآتُوهُم مِّن مَّالِ اللهِ الَّذِي آتَاكُمْ...﴾ .

٨- هەر مسوڵمانێکی بالغ لەرۆژی رەمەزانا رۆژوەکەی بەچونە لای

خێزانیو جوت بون لەگەڵیا بشکێنێت گوناهێکی گەورەیە بەپێی فەرمانی پێغەمبەر ﷺ ئەبێت کەفارەیەك لەکەفارەکان بێنێتە دی کە یەکێکیان کۆیلەیەك رزگار کردنە.

٩- خودا لە ئایەتی (١٧٧) لە سورەتی (البقرة) خۆشی ژیانی دوا رۆژو رەزامەندی خۆی بەند کردوە بەچەند شتێك کە یەکێکیان کۆیلە ئازادکردنە ئەفەرموێت: ﴿... وَلَـكِنَّ الْبِرَّ مَنْ آمَنَ بِاللهِ وَالْيَوْمِ الآخِرِ... وَالْمَلآئِكَـةِ وَالْكِتَـابِ وَالنَّبِيِّينَ وَآتَـى الْمَـالَ عَلَـى حُبِّـهِ ذَوِي الْقُرْبَـى وَالْيَتَامَى...وَفِي الرِّقَابِ..﴾ مەبەست لە (وَفِي الرِّقَابِ) کۆیلە ئازادکردنە.

١٠- رۆژی دوایی (قیامەت) رۆژی حیساب لەگەڵ کردنە، رۆژێکی زۆر سەختو ناخۆشە، هەمو مرۆڤێك لەو رۆژەیا هەمو بیروباوەڕو کردەوەی خۆی ئەگەڕێتەوە بەرچاوی، خاوەنی بیروباوەڕی راستو کردەوەی باش و رەوشتی چاكو بە راستی خوداپەرستان رویان پێ ئەکرێتە باغو باغاتی بەهەشت، بەد رەوشتانو خاوەن ستەمانو خاوەنانی کردەوەی خراپو لە خودا باخیان رویان پێ ئەکرێتە. ئاگری دۆزەخ. کردەوەیێك لەو کردەوانەی لە ورۆژەدا بە هانای مرۆڤ دێتو برینی رێگای ناخۆشو کۆسپەی بەرزو بلندی لا ئاسان ئەکات کۆیلە ئازاد کردنە. خودای بەرزی بێوێنە لە سورەتی (البلد) لە ئایەتی (١١-١٣) ئەفەرموێت: ﴿فَلَا اقْتَحَمَ الْعَقَبَةَ ۞ وَمَا أَدْرَاكَ مَا الْعَقَبَةُ ۞ فَكُّ رَقَبَةٍ...﴾. (فَكُّ رَقَبَةٍ): واتە کۆیلە ئازادکردن.

ئێمە ئەگەر لەو ئایەتانەی خستمانە بەرچاو دەربارەی کۆیلە ئازادکردن ورد ببینەوە ئەبینین تەنیا ئایەتێك کۆیلەی مسوڵمانان ئازاد کردن بە مەرج دائەنێت، ئەویش لە سزای مسوڵمان کوشتنە بە هەڵەو نەزانین.

لە ئایەتەکانی دیکە ئەفەرمویێت کۆیلە ئازاد کردن، واتە ئەو کۆیلەیە چ مسوڵمان بیێت یان نا، چونکە ئایینی ئیسلام تەماشای گیانی مرۆڤایەتی ئەکات کە لە لایەن خوداوەیەو کۆیلایەتی بە شێوە مردنێك روی تیّ ئەکات، بە ئازادکردنی ئەو مردنەی لەسەر لا ئەبات و ژیانی راستەقینەی پیّ ئەبەخشی چ مسوڵمان بیێت یان نا، چونکە خودا گیانی هەمو مرۆڤێکی هێناوەتەدی لەسەر هەر ئایینو بڕوایێك بیێت. بەلاّم ئەگەر کۆیلەی مسوڵمان هەبیێت ئەو بۆ ئازادکردن لە پیێشترە.

١١- لەو کاتانەی کە لەناو کۆمەلاّ کۆیلە هەبو کڕینو فرۆشتنی تیا ئەهاتەدی مامۆستایانی ئاین لە وتاری (خوتبە)ی رۆژانی جومعانو وەعزی رۆژانی ڕەمەزانو غەیری ڕەمەزان زۆرجار باسی خێری گەورەی کۆیلە ئازادکرنیان بە گوێی مسوڵمانەکانا ئەدا، لەو روەوە فەرمایشتەکانی پیێغەمبەریان ﷺ ئەخستە بەرچاو، لە بەر ئەمە زۆر جار ئەوانەی دەستیان بە سەر کۆیلەیا بوبیێت، دەستیان لە سەریان هەڵئەگرتو ئازادیان ئەکرد. زۆر جاریش ئەوەی دەستی بەسەر هیچ کۆیلەییێکا نەبوایەو هەبو بووابە ئەدا کۆیلەییێکی لە لایێك دەست بکەویێتو ئازادی بکات.

ئەگەر ئیێمە لاپەڕەکانی میێژو هەڵبدەینەوە ئەبینین لە خودا نزیکەکان لە هەمو لایەك بە زۆری رویان لە کۆیلە کڕین بۆ ئازاد کردنیان ئەکرد چ مسوڵمان بوبن یان نا، سوڵتان سەلاّحەددینی ئەییوبی لە کاتی خۆی نزیکەی (دە) هەزار ئەسیری کۆیلەی لە سەلیبیەکان کە مەسیحی بونو بۆ داگیرکردنی شامو فەلەستین هاتبون،

لە کیسەی خۆی کڕیوەو ئازادی کردوون، براکەی بۆ ڕەزامەندی خودا لە کیسەی خۆی نزیکەی حەوت هەزاری لەوانە کڕیوەو ئازادی کردون[1].

خوێندەواری دڵ روناکی خۆشەویستی خاوەن بیرو هۆش، بەوەی لەمەو پێش وتمانو خستمانە پێش چاو دەرمانخست بۆمان دەرکەوت کە ئایینی ئیسلام یاسای بۆ دەست بەسەر کۆیلە داگرتن دانەناوە، بەڵکو بە گەلێك شێوە ویستویەتی کۆیلایەتی لەناو وڵاتو کۆمەڵایەتی لابەرێتو وردە وردەبن بڕی بکات، ئنجا بۆمان دەرکەوت ئەوەی لە ئایین وەرگەڕاوەکان لەم ڕووەوە ئەیلێنو کاوێژی پێ ئەکەن لەوەڕین بە ئاینی ئیسلام زیتر شتێکی دیکە نیە.

ئەوانە ئەبێت بزانن بناغەی ئاینی ئیسلام زۆر بەهێزو پتەوە، چەکوشی تەنەکەیان هیچ تۆزێکی لێ هەڵناسێنێت، بیروباوەڕو فەرمانو فەرمایشتەکانی ئەم ئاینە لەناو دڵی میللەتی کورد ڕەگی بەقوڵی داکوتاوە، ئەو شێوە پەلارە لەلایەن ئەو لە ئاین وەرگەڕاوانە هیچ زەدەیێکی پێ نابەخشێو ئاڵاکەی لەناو کوردستانا هەر بەبەرزی ئەمێنێتو ئەشەکێتەوە.

---

١) اسرى الحرب عبر التاريخ .

## مەبەست لە ئەنفال و غەنائم چی یە؟

ڕەخنەیەکی دیکەی کە لە ئاین وەرگەڕاوەکان روی پێ ئەکەنە ئایینی ئیسلام باسی ئەنفالو غەنائمە (تالآنی).

سوڕەتێك لە سوڕەتەکانی قورئانی پیرۆز بە (الأنفال)ناوبراوە، چونکە ئایەتی یەکەمی ئەم سورەتە وشەی (أنفال)ی تیایە. ئایەتەکە ئەفەرمویت: ﴿يَسْأَلُونَكَ عَنِ الأَنفَالِ قُلِ الأَنفَالُ لِلّهِ وَالرَّسُولِ..﴾، ئایەتی (٤١)کی سوڕەتەکە ئەفەرمویت: ﴿وَاعْلَمُواْ أَنَّمَا غَنِمْتُم مِّن شَيْءٍ فَأَنَّ لِلّهِ خُمُسَهُ وَلِلرَّسُولِ وَلِذِي الْقُرْبَى وَالْيَتَامَى وَالْمَسَاكِينِ وَابْنِ السَّبِيلِ...﴾.

پێش ئەوەی مەبەست لە غەنیمەتو ئەنفال بخەمە بەرچاو و ماناکانی ئەمەوێت کەمێك کردەوەی ڕژێمی بەعسو صەدام لە کوردستانو کردەوەو مامەڵیان لەگەڵ کوردەکان لەو ناوچەیەدا بخەمە بەرچاو تاوەکو بزانین ئەو ڕەفتارو کردەوەیان لەگەڵ مەبەستی ئەو دوو ئایەتە لە چ رادەییێکایە، ئایە هەروەکو لە ئایین وەرگەڕاوەکان ئەڵێنو ئەیانەوێت بە خەڵکی بسەلمێنن کە کردەوەی ئەوانە ڕێکە لەگەڵ مەبەستی ئەو دو ئایەتە.

بەعسیەکان لەجاری یەکەم و دوەما کە هاتنە سەر حوکم ڕەشمالی رەشیان بەسەر هەمو عێراقدا هەڵدا، بە ستەمو بە دڕندەییو بێ مروەتی چەند جارێك بە لەشکرو بە چەکی تازەی بەهێز ڕویان کردە کوردستان، ئەوەی لەدەستیان هات لە کوشتنو لە دێهات وێران کردنو لە باغ وباغاتو زەراعەت تێکدان درێغیان نەکرد، ئەمە جگە لە

تالآن کردنی ماڵ ومالآتو ئاژەڵی دانیشتوانی کە هێرشیان ئەبردە سەریان.

لەکاتی یەکەما کە هاتنە سەر حوکم جگە لەو شەڕانەی ڕویان کردە ناو کوردەواری ڕێیان دایە بەشێك لە عەرەبەکانی دەوروپشتی کەرکوكو هەندێك لە عەرەبەکانی حەویجە، ئەمانە پەیتا پەیتا ڕویان کردە دێیەکانی دەوروپشتی ناحیەی پردێو ناحیەی شوان، تالآنێکی زۆریان لە دەغڵو دانو مەڕومالآتو نوێنو ڕایەخیان لەو دێیانە ژێردەست خستو ڕویان پێکردە دێیەکانی خۆیان، لەکاتێکا ئەو ناوچەیە شەڕی تیا ڕونەدابو پێشمەرگەی تیا نەبو.

ئەم بەعسیانە جاری دوەم کە هاتنە سەر حوکم ڕویان کردە چەند بەشێك لە دێیەکانی بارزانو دەوروپشتی بارزان، دێیەکانیان بە بەشی زۆری دانیشتوەکانی چۆڵ کرد، ئەوەی بەردەستیان کەوت تالآنیان کردو ئەو دانیشتوانانەیان هێنایە دەشتایی دەوروبەری هەولێر، لەوێ بەبێ خواردنو خواردەنەوەیەك هەڵیان رشاندن. خێرخوازانی دانیشتوانی شاری هەولێر یارمەتیان نەبوایە لەو دەشتاییە هەمویان بە هیلاك دەچون. پاش ماوەیەکی کەم هەمویانیان گواستەوە بۆ ئەو چۆڵەوانییەی کە تیایانا گیانیان لێیان بڕیو بە خاکیان سپاردن.

شتێکی دیکەی دور لە هەمو ئاینو ویژدانو مروەتێك صەدام لەساڵی ١٩٨٨ لەشکرێکی زۆری ڕو پێ کردە دێهاتەکانی بەشێکی هەرێمی کوردستان کە دەستی ستەمی ئەگەیشتێ، بەشێکی زۆری لەو دێیانە لە گەنجو ئافرەتو منداڵ دەست بەسەرا گرت، هەمویانی هەر

بەشە، روی پێ کردە لایەك لە دەشتایی خوار شاری رەمادیو غەیری رەمادی، لەو جێگایانە بە خاکیان سپاردن، هەروەکو لە مەحکەمە لە شایەدی شایەدەکان دەرکەوت.

زیاد لەمە سەربازەکانی بەشێکی زۆری لەو دێیانەی دەستیانی گەیشتێ سوتاندو وێرانیان کردو بەشێکی زۆری لە ماڵ وسامان لەو دێیانە تالان کرد، ئەمە کە بە ئەنفال ناوبراو بە غەنیمەتێکی دروست بە بێ شەرمو حەیا لە قەڵەم درا، خراپتر لەمە ئەو ناوچانەیان بە فڕۆکە بە چەکی کیمیایی، کیمیاباران کردو گەلێك کەسی تیا بە هەلاکەت چو.

دوای ئەوەی ڕابرد با بێینە سەر باسی مەبەست لە ئەنفالو غەنیمەت لەو دو ئایەتەی لە سەرەوەی ئەم باسەی خستمانە سەر کاغەز، تا بزانین کردەوەی بەعس چەندێك دورە لە ڕێکێشانی ئایینی ئیسلامو چەندێك بە پێچەوانەی مەبەستی ئەو دو ئایەتەیە، تا بۆمان دەربکەوێت درۆو بیر شڵەژاوی ئەو لە ئایین.وەرگەڕاوانە لە چ رادەییکە کە ئەیانەوێت میللەتی کوردی دڵ روناك بە ئایینی ئیسلام وەکو خۆیان بە کافریو بێبڕوایی بەرنو چرای گەشی بە شەوقی ئیمان لە دڵیانا بە فوی بۆگەنیان بکوژێننەوە.

ڕۆژی گەشی ئایینی ئیسلام کە لە دورگەی عەرەب هەڵهاتو ڕوی کردە هەمو لایەکو بلاوبۆوە، دوژمنانی ئەم ئایینە لە عارەبو غەیری عەرەب کە لە دەوروپشتی بون بە خراپیو ناخۆشی شەڕ فرۆشتن ڕویان کردە پێغەمبەر ﷺ هەڵگرانی رۆشنابیەکەی لە یارەکانی، کە

بناغەیی دەوڵەتی ئیسلامیان لە مەدینە دامەزراند، ئەمە کە بوە هۆی ئەوەی، بە شەڕکردن بەرەنگاری یەکتر ببن‌و بە کوشتن ڕوبکەنە یەکتری.

دەوڵەتی ئیسلامی لە مەدینە لەو کاتانەدا وەکو دەوڵەتی ئێستاکە خاوەنی چەك‌و خەزێنەو بارو بارگەی شەڕ نەبو. ئەو یارانەی لەگەڵ پێغەمبەر ﷺ بەرەنگاری دوژمن ئەبوون و شەڕیان ئەکرد هەمویان بە چەك‌و بارو بارگەی خۆیان ڕویان ئەکردە شەڕ کردن، ئنجا کە سەرئەکەوتن‌و دوژمنیان ئەشکاند ئەو چەك‌و ماڵ‌و ماڵاتەی لە کاتی شەڕا داگیر ئەکراو ئەوەی لە مەیدانی شەڕا لە دوژمن بە جێ ئەما غەنیمە بو ئەکەوتە دەستی مسوڵمانەکان بە پێی فەرمانی ئایەتەکە ئەکرایە پێنج بەش، بەشێکی تەرخان ئەکرا بۆ پێغەمبەرو کەس‌و کارو هەتیوانی بێ باوکان‌و کەسانی هەژارو لێقەوماوانی بێکار، چوار بەشەکەی دیکە دابەش ئەکرا بە سەر ئەوانەی بە ماڵ‌و تفاقی خۆیان پێکیان لە شەڕا ئەکرد.

ئەمەیە مەبەست لەو ئایەتەی لە سەرەتای ئەو باسەمان خستمانە سەر کاغەز کە ئەفەرموێت: ﴿وَاعْلَمُواْ أَنَّمَا غَنِمْتُم...﴾ غەنیمەت ئەوەیە لە شەڕا دەست ئەکەوێت.

واتە: دروست نەبوەو دروست نیە ڕو بکرێتە شارو دێهاتی دوژمن کە کافرن‌و بە خراپە رو بکرێتە سەر دانیشتوەکانیان کە لە شەڕا بەشدار نەبون‌و چشتێك لە ماڵ‌و ماڵاتیان داگیر بکرێت‌و بە غەنیمەت دابنرێت.

ئەمە لەگەڵ ماڵ‌و هەبوی کافر وایە کە لە مەیدانی شەڕا نیە، ئنجا چ جا لە شەڕێك لەگەڵ هاودینی مسوڵمان رو بدات‌و بکرێت!!

مسوڵمانەکان لەمەو پێش لە هیچ کاتێکا نەبوە ئەگەر لە شەڕا لەگەڵ بەشێك لە دوژمنی کافر شەڕیان کردبێت‌و سەرکەوتبن، دوای ئەوە ڕویان کردبێتە دێیەکەیان، یان شارەکەیان‌و شتێکیان تیا تالآن کردبێت یان دەستی کوشتنیان ڕوو پێ کردبێتە بێگوناهێك یان بە خراپە دەستیان بۆ ئافرەتێك درێژ کردبێت.

ئەم کارانە لە ئەوروپا، پیشەی هەمو دەوڵەتەکان بو کە لە شەڕی یەکەم‌و دوەمی جیهانی ڕویدا کە بەسەر یەکتریا سەر ئەکەوتن، هەروەها ئەمە پیشەی صربیە دیانەکان بو پێش بیست سی ساڵێك لەمەوبەر لەگەڵ مسوڵمانەکان لە کۆسۆڤۆ، هەروەها ئەمە لە کاتی خۆی، کردەوەی صەلیبیەکان بو کە چەند جارێك هێرشیان کردە سەر ولآتی شام و فەلەستین.

دەوڵەتێکی مسوڵمان ئەگەر دەوڵەتێکی دادپەروەر بوو ئەمن و ئاسایشی لە ولآتا ڕەخساند بوو بە یەك چاو تەماشای هەمو لایەکی ئەکردو بە یەك کردەوەو مامەڵە روی لە دانیشتوانی ولآت ئەکرد بەبێ جیاوازی لە بەینی تیرەیێك‌و رەگەزو ڕەگەزێك، بەلآم لەگەڵ ئەمەیا ئەگەر تیرەیێك یان بەشێك یان شارێك بە بێ هەقێك لێی هەڵگەڕایەوەو لێی یاخی بوو خۆی لێ ئەکاتەوە، ئەوە ئەو بەشە بە پێی بڕیاردانی شەرع پێیان ئەوترێت (بغات) بوغات، واتە لە سنور دەرچوان‌و یاخیان.

ئنجا ئەو دەوڵەتە بۆی هەیە هەوڵبدات یاخی بونیان پێ ببڕێ‌و هەمو رێیکی راست بگرێت بۆ ئەوەی بیانگەڕێنێتەوە بۆ لای خۆی، بەلآم هەقی ئەوەی نیە روی شەڕیان تێبکات تا ئەوان رو لە شەڕ نەکەن، ئەگەر ئەوان رویان لە شەڕ کردن بو ئەمان هەقی دەست وەشاندنیان

هەیە تا بە سەریانا زاڵ ئەبن و ئەیانخەنەوە ژێر سێبەری فێنکی خۆیان، بەڵام نابێت و دروست نیە لە هیچ مەزهەبێك لە ئایینی ئیسلاما دەست بۆ ماڵ و سامانیان درێژ بکەن و بە غەنیمەت بڕیاری بدەن.

مامۆستایانی پێشوی ئیسلام ئەمەیان رون کردۆتەوەو ئەڵێن: ئەو دەوڵەتە ئەگەر چشتێك لە ماڵ و سامانی ئەوانیان کەوتە ژێردەست، دروست نیە دەست بۆ هیچی درێژ بکەن، ئەبێت دەستی بەسەرا بگرن تا شەڕ کۆتایی دێت و دەست لە چەك بەر ئەدرێت و ئەوانە دێنەوە ریزی دانیشتوانی دیکەی وڵات، ئەو کاتە ئەبێت ئەو ماڵ و سامانە کە دەستیان بەسەرا گرتوە هەموی بگەڕێنەوە بۆ خاوەنەکانی، چونکە بە پێی فەرمانی ئایین ماڵی کەس بۆ کەسێکی دیکە حەڵاڵ نابێت.

هەرکەسێك بەمەی وتم بڕوا ناکات با تەماشای جزمی دەیەمی کتێبی (المبسوط) بکات لە لاپەرەی (١٢٤)و دوای ئەم لاپەرەیە، هەروەها تەماشای جزمی حەوتەمی (بدائع الصنائع) بکات لە لاپەرەی (١٤٠)و دواتر.

حەنەفیەکان و مالکیەکان و حەنبەلیەکان و شافعییەکان هەمویان ئەڵێن ئەو باغیانە لە شەریانا ئەگەر زیانیان بە شوێنێك گەیاندبوو ئەوەی لە شەڕا بەکار دەهێنرێت لەناویان بردبوو ئەو کەسانەی لە شەڕا بەدەستیان کوژرا بو کە شەر تەواو ئەبێت و دەستیان ئەگاتە یەکتری ئەبێت لێیان ببوردرێت و هیچ زیانێکیان پێ نەبژێردرێت، بۆ ڕاستی ئەم قسەیە ئەوەی ئەیەوێت با تەماشای جزمی حەوتەمی (نیل الاوطار) بکات لە لاپەرەی (١٦٩)و دواتر.

ئیمامی (قەرافی) کە مامۆستایەکی بەرزی مالکیەکانە ئەڵێت: ئەبێت مەبەست لە شەڕکردن لەگەڵ باغیەکان لابردنی بەغیەکەیان

بێت نەك مەبەست کوشتن‌و فەوتاندنیان بێت، هەروەها ئەڵێت: ئـەوەی لەوانە لە شەڕا پشتت تێئەکات ئەبێت وازی لــێ بهێنرێـت‌و دەسـتی خەراپەی بۆ درێژ نەکرێت، هەروەها نابێت برینـدارەکانیان بکوژرێـت‌و دروسـت نییــە دەغڵ‌ودانیــان‌و بــاغ‌و باغاتیــان بــسوتێندرێت‌و دارو دارستانیان هەڵبقەندرێت، بۆ زێدە زانــین تەماشــای جزمــی یەکـەمی (الفروق) بکە لە لاپەرەی (١٧١)، هەروەها تەماشای کتێبی (القوانین الفقهیە)بکە لە لاپەرەی (٣٦٤).

## ئەنفـــال

ئنجا با بێینە سەر باسی ئەنفال‌و بزانین مەبەست لەم وشەیە چیەو بە چی ئەوترێت.

ئایـا ئـەوەی ڕژێمـی بـەعس‌و سـەددام روی پـێ کـردە هـەرێمی کوردستان‌و ئەو بڕین‌و کوشتنەو ماڵان روخاندن‌و دێهات کـاول کـردن‌و شینایی‌و باغ‌و باغات سوتاندن‌و ماڵ‌و ماڵات‌و سامانی دانیشتوانی ئەو هەرێمە زەوتکردن‌و بە تاڵان بردنی ئایا ئەمەیە مەبەست لـە ئـەنفال؟ هەروەك وا بە گوێیا دراو ئەوها لە ئاین وەرگەڕاوەکان کاوێژی ئەکەن و بڵاوی ئەکەنەوەو ساویلکەو نەزانانی پێ ئەخەڵەتێنن.

ئەنفال چی یە؟ هەندێك لـە مامۆسـتایانی پێـشوی ئـایین ئـەڵێن: مەبەست لـە ئـەنفال غەنیمەتـە، ئـەو غەنیمەتـەی کـە لەمـەوپێش مەبەستەکەیان زانی‌و باسەکەیان رون کـردەوە، بـەڵام ئـەوەی راسـت‌و تەواوە ئەنفال مانایەکی جیاوازی هەیـە لەگـــەڵ مانـای غەنیمـەت، چونکە هەر یەکەیان لـە ئایـەتێکی تایبـەتی دیـار کـراوە، هـەروەکو لەمەوپێش دیتمان.

ئەنفال لە زوبانی عەرەبیا کۆی نەفەلە واتە زێدەو پتر، لەوەی ڕابـرد کە ئەو غەنیمەتەی لە کاتی شەڕا لەگەڵ دوژمنی غەیرە ئایین ئەهاتـە دەست‌و ئەوەی لە مەیدانی شەڕا لێی بەجێ ئەما لە پێنج بەشـا چـوار بەشی بەسەر ئەوانەیا دابەش ئەکرا کە لە شەڕا بەشدار بون. ئنجا هیچ

کەسێك لەوانە هەقی سەر ئەوەی نەبو شتێك لەوەی لە کاتی شەڕا ئەکەوێتە ژێردەستی بۆ خۆی هەڵی بگرێت زیاد لەوەی لەو غەنیمەتە بەری ئەکەوێت. هەمو زێدەیەك ئەبو بگەڕێتەوە ناو ئەو غەنیمەتەی کە دوایی بەش ئەکرا.

ئایەتەکە کە لە غەزای بەدرا هاتۆتە خوارەوە ئەفەرموێت: ﴿يَسْأَلُونَكَ عَنِ الأَنفَالِ قُلِ الأَنفَالُ لِلّهِ ..﴾، واتە: ئەی محەمەد پرسیارت لێ ئەکەن لەو زیادەیەی لە شەڕا ئەکەوێتە دەست یەکێك بۆ هەیە بۆ خۆی بێت. ئەفەرموێت: نا ئەوە هی خودایە بەشێکە لە هەمو ئەو غەنیمەتەی دێتە دەستو بەسەر هەموان دابەش ئەکرێت بە بێ هیچ زیادەیەك کەسێك بۆ خۆی تەرخانی بکات.

بەلاَن سەرۆکی ولاَت یان سەرۆکی ئەفسەرانی شەڕ بۆیان هەیە شتێك لەو غەنیمەتەی دێتە دەست، پێش بەشکردن بداتە یەکێك کە لە شەڕا ڕەشیدێیکی دیارو ئاشکرای نواندبێت وەکو ئەوەی هەڵپەی بردبێتە سەر گەورەی بەڕێوەبەری لەشکری دوژمنو کوشتبێتی.

هەروەها وەکو ئەوەی سەرۆکی ئەفسەرانی شەڕ بڵێت هەر کەسێك بتوانێت بگاتە جبەخانەی دوژمن بیتەقێنێتەوەو لەو غەنیمەتەی دەست ئەکەوێت لە بەشی خۆی زیاتر چشتێکی بە نرخی بۆ بڕیار ئەدەم و ئەیدەمێ، هەر شتێکی تر وەکو ئەمانە.

ئەمەیە مانای ئەنفال نەك تالاَنکردنی ماڵو مالاَتو سامانی مسوڵمان هەروەکو ڕژێمی بەعسی صەدام لە هەرێمی کوردستان روی تێ‌کردو هێنایەدی.

# سـزادان

لەناو کۆمەڵا چەند کردەوەیەکی خراپ هەیە کە ڕو ئەدات لە لایەن هەندێك بە کردەوەو بەدرەوشت کە لەناو وڵاتا ئەبێتە مایەی ئاشوبو ناخۆشیو دوژمنیو دوژمنایەتی. ئایینی ئیسلام بۆ بەر بەست کردنی هەر یەکە لەو خەراپانە سزایێکی تایبەتی داناوە کە ئەبێت رووی تێبکرێتە ئەو کەسانەی ئەو خەراپانە دێننەدی.

لە ئایین وەرگەڕاوەکان لێرەشا ڕەخنە لە ئایێنی ئیسلام ئەگرن و تانەوتەشەری پوچەڵو چەوتیان روی پێ ئەکەنە ئەم ئایینەو ئەو سزایانە بە خەراب ئەخەنە بەر چاوو ئەڵێن لەم چەرخەیا لەگەڵ عەدالەت ناگونجێتو رێك نیە.

ئنجا با یەك بە یەك ئەو کردەوە خەراپانەو سزاکانی بخەینە بەرچاوو کەمێکی لێبدوێن تا بۆمان دەرکەوێت چەند ئەو لە ئاین وەرگەڕاوانە بیروباوەڕیان کۆڵەو تێگەیشتنیان کەم ئەبرێت و وتاریان بە پێچەوانەی دادپەروەریە.

## ١- سـزای کوشـتن:

هەر کەسێك بەبێ هیچ هەقێكو بە غەدر دەستی کوشتن بۆ یەکێك درێژ بکاتو بیکوژێت کەسوکارەکەی هەقیان هەیە داوای تۆڵەسەندن لەو کەسە بکەن تا دادگا بۆیان ئیعدام بکات. ئنجا دادگا ئەبێت ئەو داواکردنەیان بێنێتە دی.

کوشتن بەبێ هەق دو خەراپە ئەبەخشێ، خراپەیکێیان رو ئەکاتە کوژراوەکەو کەسوکارەکەی، خراپەکەی دیکە رو ئەکاتە کۆمەڵو ئاشوبی تیا دێنێتەدی.

کوشتن بە ناهەق روی لە گیانێکە لەناو کۆمەڵا کە بەشێکە لە گیانی ئەو کۆمەڵە، کە هەمو دانیشتوەکانی تیا بەشدارە. ئەوەی بە ناهەق رو بکاتە گیانی یەکێك وەکو ئەوە وایە روی کردبێتە گیانی کۆمەڵایەتیو ژیانیا، بۆیی وتمان جگە لە هەقی کوژراوو کەسوکارەکەی کۆمەڵایەتیش بەشدارە لەو هەقەیا.

لەبەر ئەمە خودا لە باسی کوشتنی هابیل لە لایەن براکەی قابیل لە ئایەتی (٣٢) سورەتی (المائدة) ئەفەرموێت: ﴿مِنْ أَجْلِ ذَلِكَ كَتَبْنَا عَلَى بَنِي إِسْرَائِيلَ أَنَّهُ مَن قَتَلَ نَفْسًا بِغَيْرِ نَفْسٍ أَوْ فَسَادٍ فِي الأَرْضِ فَكَأَنَّمَا قَتَلَ النَّاسَ جَمِيعًا وَمَنْ أَحْيَاهَا فَكَأَنَّمَا أَحْيَا النَّاسَ جَمِيعًا...﴾ ئەفەرموێت: هەر کەسێك بەبێ هەق کەسێکی دیکە بکوژێت وەکو ئەوە وایە هەمو خەڵکی کوشتبێت چونکە ئەو کوشتنە روی کردۆتە گیانێك کە هەمو خەڵك تیا بەشدارە.

لە یاسا بڕیاردان بە تۆڵە وەرگرتن بە ئیعدام لەو کەسەی بەناهەق یەکێك ئەکوژێت ژیانی تیایەو ژیان ئەبەخشێ نەك مردن،خودای بەرزی بێوێنە لە ئایەتی (١٧٩) لە سورەتی (البقرة) ئەفەرموێت: ﴿وَلَكُمْ فِي الْقِصَاصِ حَيَاةٌ يَا أُولِيْ الأَلْبَابِ﴾، واتە: ئەی خاوەنانی بیرو هۆش بڕیاردان بە تۆڵە وەرگرتن بە کوشتن لە بکوژ، ژیان ئەبەخشێت نەك مردن.

ئەو بڕیاردانە (ئیعدام) ژیانە بۆ ئەو کەسەی ئەیەوێت کەسێك بە غەدر بکوژێت، چونکە ئەزانێت بەو روتێکردنەی ژیانی خۆی لەناو

ئەبات و ئیعدام ئەکرێت، ژیانیش لای مرۆڤ شیرینە تا بۆی بکرێت دەستی بۆ بەسەرەوە ئەکرێت و لە ناوی نابات، ئەمە زۆر کەس لە روکردنە کوشتن دور ئەخاتەوە کە مایەی ژیانە بۆی.

ژیانە بۆ ئەو کەسەی یەکێك بیەوێت روی کوشتنی تێ بکات، چونکە ئەو کەسە لەبەر تۆڵەسەندن هەر وا بە ئاسانی روناکاتە کوشتن، هەروەها ژیانە بۆ کۆمەڵایەتی، چونکە بە زۆری ئەبێتە هۆی ئەوەی کەسێك بە غەدرو بە بێ هەق روی کوشتن نەکاتە ئەندامێك لە ئەندامەکانی کە لە ژیانا بەشداره لەگەڵیان و ئاشوب و ناخۆشی تیا پەیدا نەکات و ئەی هێنێتە دی.

فەرمایشتی خودا لە کۆتایی ئایەتەکە، کە ئەفەرموێت: (يَا أُولِيْ الأَلْبَابِ) مانایەکی زۆر وردو قوڵی تیایە، فەرمایشتە بۆ ئەوەی ئەبێت بیر لە ئەمن و ئاسایشی وڵات و میللەت بکرێتەوەو رێنەدرێت ئاشوب و ناخۆشی و دوژمنایەتی تیا روبدات، دواتر نابێت بە چاوی بەزەیی تەماشای یەکێك بکرێت کە ئەندامێکی لە ئەندامەکانی کۆمەڵ لە ناوداوەو گیانی لێ وەرگرتوەو خشتێکی لە بناغەی کۆمەڵایەتی هەڵقەندوەو بەسەر یەکا شکاندویەتی.

فەرمایشتێکە روو ئەکاتە خاوەنانی بیری رێك و هۆشی تەواو داوایان لێ ئەکات کە بڕیاردانیان ئەبێت بە پێی تەرازوی ڕاست و تەواو بێت، چی چاکە ئەوەی لێ روبدات، دەست بەخوێنان ئەگەر تۆڵە رویان تێنەکات و ئیعدام نەکرێن، ئەمن و ئاسایش لەناو کۆمەڵ و وڵاتا لەنگ ئەبێت و میزانی تێك ئەچێت.

فەرمایشت کە ئەفەرموێت: (وَلَكُمْ فِي الْقِصَاصِ حَيَاةٌ) فەرمایشتە کە ئەوەی بەبێ هەق ڕوو ئەکاتە ژیانی کەسێك، ڕوو ئەکاتە کانگەی ژیان کە هەمو کەسێك تیا بەشدارەو بەشێکە لەو کانگەیە، دەستی خراپەو روخاندنی بۆ درێژ ئەکات، سستی بەرامبەر ئەو دەستە خوێناویەو تۆڵە لێ نەسەندنی ئازاردانی هەمو دانیشتوانی کۆمەڵو وڵات ئەبەخشیو ڕێ پێدانە بە هەمو دەستێکی ستەمکار بە پێی هەواو ئارەزوی خۆی دەستی خراپە بوەشێنێتو مردن بێنێتە دی.

ئەوانەی ئەڵێن تۆڵەسەندن (ئیعدام) کارێکی خەراپەو ئەبێت بەربەست بکرێتو لە یاسایا ڕێی پێنەدرێت، ئەوانە ئەگەر بە باشی وردببنەوەو هۆشی خۆیان بە ڕێکی بەکاربێنن ئەبینن لەوەی لەسەرین بە هەڵەیا چوون، چونکە:

١- ژیان بەخشینێکی خودایەو ئەو داویەتی نەك یەکێکی دیکە تا بۆی هەبێت بەبێ ڕێکێشانێکی خودا ڕوی نەهێشتنی تێبکات. ئەوەی بە ناهەق دەستی نەهێشتنی بۆ درێژبکات، بە هەق ڕێ ئەدات بۆ ئەوەی دەستی نەهێشتن بۆ خۆی درێژ بکرێتو بەو پێیە مامەڵەی لەگەڵ بنوێندرێت کە خۆی کردویەتی.

ئەوەی دەست بۆ ماڵی یەکێك درێژ بکات و لە ناوی بەرێت هەمو یاسایێك ڕێ ئەدات زیانەکەی پێبژمێردرێت، ئنجا ئایە ماڵ بە نرخترە یان ژیانی ئادەمیزاد؟

٢- یەکێك ئەگەر بە ناهەق یەکێکی کوشت ئەگەر ئەو کەسە ئیعدام نەکرێت، کەسوکاری کوژراوەکە ژیانیان پێتاڵ ئەبێت تا تۆڵەی کوژراوەکەیان لە کابرای بکوژ وەرنەگرن، بۆ هێنانەدی ئەمە هیچ

درێغییك ناكەن، وا ئەبێت هەلیان بۆ رێك ئەكەوێت ئەو كەسەو ئەو خزمە پشتییەی لەگەڵیەتی ئەكوژن، دوایی كەس‌وكاری ئەمان دەست لەو تۆڵە وەرگرەو خزمانی ئەوەشێنن، ئنجا بە ساڵەهای ساڵ دوژمنایەتی پتر ئەكەوێتە بەینی دو بنەماڵە، یان دوخێڵ، ئنجا لە هەر دولا چەند كەسێكیان ئەكوژرێت‌و ئاشوب‌و ناخۆشی روئەكاتە ناو كۆمەڵ‌و پەتی ئاسایشی تیا ئەپچڕێت.

بەڵام ئەگەر یەكەم جار كابرای بكوژ لە قەنارە بدرێت‌و گیانی لێوەر بگیرێت كەسوكاری هیچ كینەییكیان روناكاتە كەس‌و كاری كوژراوی یەكەم جارو ئاگری دوژمنایەتی لە بەینیان هەڵناگیرسێ ئەوەی بە ناهەق یەكێك ئەكوژێت نابێت بە چاوی بەزەیی تەماشا بكرێت‌و – هەروەكو لەمەوپێش وتمان – هەقی كوژراو كەسوكاری بخرێتە پشتگوێ‌و تەماشای ئاگری ناو دەرونیان نەكرێت كە كابرای بكوژ تیا هەڵیگیرساندوە.

٣- ئەشێت بوترێت لە قەنارەدان كوشتنی لەناو كۆمەڵا لانەبردوە، بەڵێ كوشتن لەناو هەمو كۆمەڵێك‌و ولاتێكا هەیەو بەردەوامە، بەڵام ئەگەر لە قەنارەدان هەمو تینوی خوێنێكی دەست نەبەستبێتەوە بن بڕی نەكردبێت، ئەبێت بزانین بەشێكی زۆری لە روكردنە ئەم خراپەیە جڵەو كردوە، چونكە بیر لە نەمانی خۆیان‌و بێوەژن بونی خێزانەكانیان‌و هەتیوبونی ماڵ‌و منداڵەكانیان‌و پەراگەندەبونیان ئەكەن.

دوكتۆر حەمید سەعدی لە لاپەڕەی (٤٣٣) لە كتێبەكەی (النظرية العامة لجريمة القتل) ئەڵێت: ئەوەی وا ئەزانێت سزای ئیعدام نیسبەتی كوشتنی كەم نەكردۆتەوە وانیەو روداو بە درۆی

ئەخاتەوە، چونکە لە ژماردنی ئەم جەریمەیە دەر ئەکەوێت کە ژمارەی کوشتن لەو ولاتانەی یاسایان بڕیاری ئیعدام کردن ئەدات روو لە کەمیە بە پێچەوانەی ئەو ولاتانەی سزای ئیعدامیان لابردوە.

٤- بەشێك لە ولاتان ئەم سزایەیان لابردوە، بەلام هەندێکیان دوای لێکۆڵینەوە پێویستیەکەیان بۆ دەرکەوتوەو گەڕاندویانەتەوە. روسیا چەند جارێك لایبردوە دوایی گەڕاندویەتەوە، دواترین گەڕاندنەوەیان لە ساڵی (١٩٥٤) بو.

لە ولاتی سەیلان ئەم سزایەیان لە ساڵی (١٩٥٦) لابرد، تەماشایان کرد نیسبەتی کوشتن روو لە زۆر بونە، لە (٢٦) مانگی ئاب لە ساڵی (١٩٥٩) یەکێك لە دانیشتوانی ولات توانی بگاتە ماڵی سەرۆك وەزیران (بەندرانیکەو) بیکوژێت، دوای ناشتنی جەنازەکەی پەرلەمانی ولات بە شێوەیەکی پەلە گردبوەو دوای لێکۆڵینەوەی چوار سەعات بڕیاریاندا سزای ئیعدام بگەڕێتەوە ناو یاسای ولات.

٥- ئەوەی لە کاتی هەڵەیێکی بێمەعنا ڕووئەکاتە بەرامبەرەکەی و ئەیکوژێت بەبێ ئەوەی بیر لە دواهاتوی خۆی و ماڵ و منداڵەکانی بکات و بەبێ ئەوەی بیر لەوە بکات کە بەو روتێکردنەی ناخۆشی بە کۆمەڵ ئەگێنێ، ئەوە لە ناو کۆمەلا ئەندامێکی پوچەڵی بێکەڵکی زیان بەخشە، پێویستە تیا نەهێلدرێت، ئەوە وەکو دەستێك وایە توشی سەرەتان بوبێت، ئەبێت ببڕدرێت، گەرنا نەخۆشیەکەی پەرە ئەستێنێت و لاییکی دیکەی ئەگرێت.

وتمان کوشتن سێ هەقی تیایە هەقی کوژراو و هەقی کەسوکاری کوژراوو هەقی کۆمەڵ (هەقی گشتی) هەقی کوژراو وەکو میرات

ئەگەڕێتەوە بۆ کەسەکانی، ئەوانە هەقی داواکردنی ئیعدام کردنی بکوژیان هەیە، دادگا ئەبێت ئەو هەقەیان بۆ بڕەخسێنێ، بەڵام ئەگەر ویستیان لە کابرای بکوژ خۆشبن ئەوە خودا جەزایان بە چاکە ئەداتەوە. دادگا لێرەیا تەماشای هەقی کۆمەڵ ئەکاتو جەزایێکی گونجاو لە سەر بکوژەکە دائەنێت.

ئەگەر کەسوکاری کوژراو چەند کەسێك بوون وەکو چوار برا، ئەگەر یەکێك لەو برایانە لێخۆشبونی نیشاندا بەڵام سیانەکەی دیکە بەم بڕیارە قایل نەبونو داوای ئیعدام کردنیان کرد، لای زۆربەی مامۆستایانی ئاین بڕیاردانی برای لێخۆشبو ئەچێتە سەرو ئەبێت ئەوەکانی دیکەش پێی رازی بن.

## ٢- سزای دامێن پیسی:

خودای بەرزی بێوێنە بۆ بەردەوام بونی ژیان لە ئادمیزادا نێرو مێی هێناوەتە دی، هەروەکو ئەمە وایە لە هەموو گیان لەبەرەکانی دیکە، چ گەورەبن یان گچکە، چ فڕندەبن یان بێباڵ، چ لەناو ئاوا بژین یان لە چۆڵاییو دەشتایی.

بەردەوامبوونی ژیان لە ئادەمیزاد بە یەکگرتنی ئافرەتو مرۆڤ دێتە دی ئەبێت ئەو یەکگرتنە بە ڕێکێشانی خودا بێت کە لە ئایینەکەی بۆمانی دەرخستوە، نەك بە شێوەیێکی بەرەڵلایی بێت هەروەکو لە گیانلەبەرەکان دیکە دێتەدی.

پیاو یان ئافرەت ئەبێت دەست بەسەر ناموسو شەرەفی خۆی بگرێت، نابێت وەکو گیانلەبەرەکانی دیکە هەریەکە هەر رۆژە ڕوو لە

یەکێك لەوەکەی دیکە بکاتو لەگەڵی گردببێتەوەو پێکەوە جووت بن، هەروەکو ئەمە پیشەی بەشێکی زۆری نێرو مێی دانیشتوانی وڵاتانی غەیری مسوڵمانەکانە لە ڕۆژئاواو لە ڕۆژهەڵات.

ڕێدان بەو شێوە گردبوونەوەیە کۆڵەگەی کۆمەڵایەتی لار ئەکاتو ئەی هەژێنێ، بناغەی خێزانداری تێك ئەدات، ڕیشەی خزمو خزمایەتی لە یەك ئەپچڕێ، میهرەبانی باوكو نەوەو نەتەوە کز ئەکات، کەس ئاگای بەسەر کەسێکی دیکەوە نامێنێتو یارمەتیدان لە بەینیان نمودێکی وای نابێت.

ژمارەی دانیشتوانی وڵات لە باتی زۆر بوون ساڵ بە ساڵ روو لە کەم بوون دەکات هەروەکو ئەمە دیارو ئاشکرایە لە هەندێك لە وڵاتەکانی ڕۆژئاوا بە تایبەتی وڵاتەکانی ئەسکەندیناڤیا کە ئەم شێوە یەکگرتنەی هەردوو بەشی نێرو مێ تیانا کارێکی بڵاوەو یاسا ڕێی پێ‌ئەدا، بەبێ ئەوەی بیر بکرێتەوە کە ئەو شێوە یەکگرتنە چ جیاوازیەکی لەگەڵ یەکگرتنی خاوەن ژیانەکانی دیکە هەیە کە ئەو بیرو هۆشو تێفکرینو زوبانو قسەو وتارەی کە بە ئادەمیزاد خەڵات کراوە ئەوان لێی بێبەشن.

گردبونەوەو یەکگرتنی پیاوێكو ئافرەتێكو ئەوەی لە بەینیان ڕوو ئەدات ئەبێت بە پێی فەرمانی خوداو فەرمایشتی پێغەمبەر ﷺ ڕوو بدات، کە بە مارەکردنێکی شەرعی دروستەو ڕێی پێ‌ئەدرێتو موبارەکی بە دواوەیە، بە نەوەو نەتەوە لێ‌ڕوودان.

ئەو یەکگرتنە ئەگەر لەو ڕێیوە نەبێت بە فەرمایشتی ئایینی خودا پێی ئەوترێت (زینا) کە خودا لە قورئانی پیرۆزا سزایەکی تایبەتی بۆ

دیار کردوەو فەرمانی داوە ڕوی پێ بکرێتە ئەوانەی ئەو شێوە گردبونەوەیان لێ ڕو ئەدات لە هەر دوو بەشی ئادەمیزاد لە نێرو لە مێ.

ئەو سزایەش ئەوەیە کە خودا لە ئایەتی(٢) لە سورەتی(نور) ئەفەرموێت: ﴿الزَّانِيَةُ وَالزَّانِي فَاجْلِدُوا كُلَّ وَاحِدٍ مِّنْهُمَا مِئَةَ جَلْدَةٍ وَلَا تَأْخُذْكُم بِهِمَا رَأْفَةٌ فِي دِينِ اللهِ إِن كُنتُمْ تُؤْمِنُونَ بِاللَّهِ وَالْيَوْمِ الْآخِرِ وَلْيَشْهَدْ عَذَابَهُمَا طَائِفَةٌ مِّنَ الْمُؤْمِنِينَ﴾، واتە: ئەوەی لە ڕێکێشانی خودا لا ئەدات چ مرۆڤ بێت یان ئافرەت، ڕوو ئەکاتە دامێن پیسی کە زینایە سزایان سەد دار لێدانە، ئەوەی ڕو لەو کارە بکات نابێت لەو سزا دانە بەزەییتان پێی بێت، ئەگەر ئێوە بەڕاستی بڕواتان بە خوداو بە دوارۆژ هەیە، ئەو دارکاریە ئەبێت بە ئاشکرا بێتەدیو لەبەرچاوی بەشێك مسولّمانەکان ڕوبدات تا ببێتە عیبرەت بۆ کەسانی دیکە.

ئەوانەی بە سافیلکەیی تەمەشای ئەم بڕیاردانە ئەکەنو تێگەیشتنیان کەم ئەبڕێتو زانینیان کەمە چ لە ئایین وەرگەڕاوبن یان نا، ئەڵێن: بڕیاردان بەم سزایە چۆن لەگەڵ شارستانیەتی ئەم چەرخە ڕێك ئەکەوێتو چۆن ئەبێت لە یاسایا ڕێی پێبدرێت.

ئەوانە وا ئەزانن ئەگەر ئەم سزادانە لە یاسا هەبێتو ڕێی پێبدرێت هەر ڕۆژە ئەبێت چەند کەسێك بەر ئەم سزادانە بکەوێتو کە حەیاچونی تێدایە، هەروەها ئەڵێن: ئەمە کارێکە بیرو هۆش ڕێی پێنادات.

ئەوانە نازانن یا بە ئانقەسد خۆیان گێل ئەکەنو نایانەوێت تێبگەن کە ڕووکردنە ئەم سزادانە هەروا بە ئاسانی نابێت، زینا ئەبێت بە شێوەیەکی شەرعی دوور لە هەموو گومانێك دەربکەوێت، ئەمەیش بەوە ئەبێت کە چوار کەسی ڕاستگۆی دیندار هەموویان لای قازی

شایەدی بدەن، هەریەکە بڵێت من بە چاوی خۆم دیتم دەعبای ئەو پیاوە چوە دەعبای ئەو ئافرەتە- واتە هەروەکو چۆن خەنجەرێك ئەکرێتە ناو کێلانەکەی- ئنجا ئەگەر سێ کەس لەو شایەدانە وتیان ئێمە هێنانەدی ئەو کارەمان بە چاوی خۆمان دیت، یەکی تریان وتی من بەشی خوارەوەیی کابراو بەشی خوارەوەی ئافرەتەکەم بەڕووتی دیت، بەلام دەعبای کابرام نەدیت بچێتە دەعبای ئافرەتەکەوە، زینا لێرە ئیسپات نابێتو شایەدی سیانەکە وەرناگیرێتو بە بوهتان دائەندرێتو ئەو سزایەی ڕوونادات بەلام سزادانێکی تایبەتی ڕوو ئەکاتە ئەو سیانە کە شایەدیەکەیان بە بوهتان دائەندرێت. دەربارەی ئەو شایەدییە بۆ ئیسپات بونی زینا چەند شەرتێکی دیکەی تیایە لێرە پێویست بە درێژە پێدان ناکات.

یەکێك ئەگەر کەسێك بە ناهەق بکوژرێت بۆ بە ئیسپات بونی ئەو کوشتنە دوو شایەدی بۆ بەسە کە ئەبێتە هۆی ئەوەی ئەو کەسەی شایەدی لەسەرئەدرێت ملی بەپەتەوە بکرێتو گیانی لێ بسێندرێت، بەلام بۆ دەرکەوتنی زینا چوار شایەدی ئەوێت کە هەر چواریان یەك شایەدی بەو شێوەیە باسمان کرد بدەن، چونکە خودا ئەیەوێت تا بلوێت عەرزو ناموسی کەس لەکەدارو بریندار نەکرێتو هەروا بە ئاسانی ئەو کارە دەرنەکەوێتو ئاشکرا نەبێتو ئەو سزایەی لێ ڕونەداتو کارەکە تا بکرێت بە نهێنیو شاردراوە بمێنێتەوە.

ئنجا با بزانین لە چەند ملیۆن - ناڵێم لەسەدا چەند - بەو شێوەیەی باسمانکرد زینا ئاشکراوئیسپات ئەبێت تا ئەو سزایەی لێروبدات.

ئافرەتێك و مرۆڤێك ئەگەر ڕووبکەنە ئەو کارە حەرامە چڵکنە گوناهـ بەخشە زۆر بە دزیو بەنهێنی ڕووی تێئەکەن، بە شێوەیێك کە هیچ کەسێك نەیبینێ ئنجا جا چوار کەس.

مەبەست لە فەرماندان بەو سزایە بە ڕاستی پێش ئەوەی مەبەست پێی سزای هێنانەدی ئەو کارە گوناهـ بەخشە بێت، مەبەست پێی دەرخستنی خراپیو چڵکنی ڕوو کردنە ئەو کارە، کە ئابڕوچونی تێدایەو حەیاچون ئەبەخشێ بە تایبەتی بۆ ئافرەت، نابێت پیاو و ئافرەتی بڕوادار بە خوداو بە پێغەمبەری خودا قاچیان بخلیسکێتو ڕوویان بە لای ئەو کارە وەرگێڕن، هەروەها مەبەست پێی دەرخستنی زۆر گەورەییو خراپی ئەو کارەیە (زینا)، چونکە کاری زۆر خراپی لێ ڕو ئەدات، وەکو ئەوەی ئافرەتەکە زگی پڕ بێتو لای خەڵك ئەو کردەوە عەیبدارەی لێ ئاشکرابێتو ڕوو زەردو سەر شۆڕ بێت.

ئنجا کە منداڵەکەی ئەبێت کێ ئەبێتە باوکیو سەرپەرشتی ئەکات؟ زۆر جاریش وائەبێت کەسوکاری ئافرەتەکە بۆ ئەوەی لەناو خەڵك عەیبدار ئەبن، ئەو منداڵە دوای بونی یەکسەر ئەکوژنو توشی گوناهی کوشتن ئەبن، یان لە پەڕۆیێکی ئەپێچن و بەنهێنی ئەیبەن لە سوچی کۆڵانێك، دایئەنێن بە ئومێدی ئەوەی خێرخواهێك کە گوێی لە گریانی منداڵەکە ئەبێت هولیبگرێتەوەو بەخێوی بکات. واشئەبێت کەس و کاری ئافرەتەکە کە هەست بەوکارە خراپەی ئەکەن قینیان بە توندی هەڵئەستێو ئەیکوژن.

ئەوەی من بزانم بە درێژایی مێژوی دەوڵەتی ئیسلامی لە هیچ کاتێکا هیچ کەسێك لەوانەی ڕویان کردبێتە ئەو کارە خەراپە چ پیاو

بو بێت یان ئافرەت ئەو کردەوەی بەو شێوە شەرعیەی باسمان کرد لە سەر ئیسپات نەبوە تا توشی ئەو سزایە بوبێت، چونکە ئەوەی ڕووی دابێت لەوکارە خەراپە بە نهێنی ڕوویداوەو شایەدی لەسەر نەهاتۆتەدی.

هێنانەدی ئەو کارە حەرامە چڵکنە بە شێوەییك کە لەوانە بێت زۆر بە ئاشکرایی بێتەدیو چوار کەسی ڕاستگۆ ئەو کردەوەیە ببینن‌و ببنە شایەد، هیچ ڕوو نادات مەگەر پیاوێك‌و ئافرەتێك جڵو بەرگی حەیاو حورمەت لە خۆیان دامالن و شێوەی ئادەمیزادیان لانەمێنێت‌و شێوەو خووی بەراز وەرگرن‌و نەزانن حەیاو شەرم چیە لە باغێکی گشتیا لە بەرچاوی بەشێکی زۆر لە خەڵك ڕووبکەنە ئەوکارەو بیهێننەدی، ئنجا ئایە ئەو دوکەسە ئەو سزادانە دەربارەیان شتێکی زۆر کەم نیە؟ ئایا ئەوانە هەقی ئەوەیان نیە هەر لەو جێیە هەناسەیان لێ ببردرێت؟

هەروەکو وتمان ئایینی ئیسلام تابۆی بکرێت ئەیەوێت دەست بەسەر حەیاو حورمەت‌و شەرەفی هەمو مرۆڤێك‌و ئافرەتێك بگرێت تا لەناو کۆمەڵا توشی کەمێك‌و هیچ عەیبەێك نەبن.

پێغەمبەر ﷺ فەرمویەتی: هەر کەسێك چ پیاوبێت یان ئافرەت ئەگەر پێی خلیسکاو توشی ئەو کارە خەراپە بو -دامێن‌پیسی- با هەر لای خۆی بە نهێنی بمێنێت لای کەس باسی نەکات. هەروەکو ئێستاکە هی وا هەیە بەبێ شەرم حەیا لەناو ڕەفیقەکانی خۆی ئەو کردەوە خراپەی خۆی لەگەڵ ئافرەتێك دەرئەخات‌و باسی ئەکات‌و ناموسی بریندار ئەکات.

پێش ئەوەی کۆتایی بەم باسە بێنم ئەمەوێت چەند لاێیکی دیکەی بخەمە بەرچاو:

١- سزادانی ئەو کارەو ئیسپات بونی هەر دەربارەی مرۆڤ و ئافرەتی مسوڵمانە، مرۆڤ و ئافرەتی غەیرە مسوڵمان ناگرێتەوە، مەگەر خۆیان بە ئارەزووی خۆیان بێنە لای قازی، بڵێن بڕیاردانی شەرعی ئیسلامیان بە سەرا بڕیار بدە.
٢- ئیسپات بونی ئەو کارە بە دەم پێهێنانیش ئەبێت، مرۆڤێك و ئافرەتێك ئەگەر بە ئارەزوی خۆیان بە بێ هیچ خورتییەك لای قازی ئیعترافیان بەو کردەوەی خۆیان کرد زیناکە ئیسپات ئەبێتو سزاکەی لێ روئەدات.
٣- زگ پڕ بونی ئافرەت بە منداڵ لای بەشێك لە مامۆستایانی ئایینی زینای پێی ئیسپات ئەبێت، لای بەشێکی دیکە وەکو شافعیەکانو حەنەفیەکان پێی ئیسپات نابێت، ئەم ڕایە لای ئەمانە دوربینی تێدایە، چونکە وا ئەبێت حەیوانێکی مەنەوی مرۆڤێك بە شێوەیێك لە شێوەکان ڕوو بکاتە رەحمی ئافرەتێكو زگ پڕبونی لێ ڕوبدات.
٤- ئیسپات بونی ئەوکارە تەنیا ئەبێت لای قازی بێت، سزادانیش ئەبێت بە فەرمانی ئەو بێت، هیچ کەسێك، یان بەشێك -وەکو حیزبێك- ئەو هەقەی نیە ئنجا ئەگەر قازی شەرعی نەبو حوکمەکە نابێت و ڕاناوەستێت.
٥- ئەگەر زیناکە ئیسپات بو سزاکەی سەد دار لێدانە وەکو زانیمان، ئەو دار لێدانە نابێت زۆر بە قایم بێتو زیان ببەخشێ، یان زۆر هێواشبێتو ئازاردانێك نەگەێنێ، هەروەها نابێت لە لەشا ڕووی پێبکرێتە یەك جێ، چونکە زیان بەو جێیە ئەگێنێ، ئەبێت بەسەر

لەشا دابەش بکرێت بەبێ ئەوەی ڕووی پێ بکرێتە چەند جێیێك كە فەوتانی لێ ڕوبدات، یان ئازاری زۆر بگەیێنێ.

٦- ئەشێت یەكێك بڵێت ئەو كارە ئەگەر بە شێوەیێکی شەرعی لە بەینی پیاوێك‌و ئافرەتێکا هاتەدی‌و ئیسپات بو، با بەو سزادانە سزا نەدرێن كە سزادانێکی قورسە، با بە زیندانی كردن بۆ ماوەیێکی تایبەتی حوكم بدرێن كە ئەمە رێكترو باشترە.

بەو كە ئەوترێت نا ئەوە باشترنیەو خراپە، باشیەكەی ئەوەیە كە خودا دیاری كردوەو بڕیاری پێداوە، چونكە:

١- زیندانی كردن هیچ ئازارێکی تێدا نیە تا ببێتە هۆی ئەوەی ئەو كەسە جارێکی دیكە ڕوو لەو كارە نەكات.

٢- ئەو زیندانی كردنە زیان بە خەزێنەی دەوڵەت ئەگەیێنێ كە ئەبێت لەو ماوە زیندانی كردنە یا ژیانی بۆ بڕەخسێندرێت، واتە بەرامبەر كردەوە خراپەكەی چاكەی لەگەڵ بكرێت.

٣- ئەو كەسە چ پیاو بێت یان ئافرەت لە ماوەی زیندانی كردنیدا دەستی لە هێنانەدی ئیش‌وكاری خۆی ئەبەسترێت‌و دوای ئەخات لە پەیاكردنی رزق‌و دەرامەتی بۆ ژیانی خۆیی‌و ئەوانەی ئەو ئیدارەیان ئەدات.

٤- دواتر ئەو زیندانی كردنە وەكو ئەو سزادانەی كە خودا فەرمانی پێداوە نابێتە عیبرەت بۆ یەكێکی دیكەو ڕێی ڕووكردنە ئەو خراپەیەی لێناگرێت‌و وەكو سزای ئەو سەد دار لێدان نیە كە لەبەرچاوی خەڵك ڕوو زەردی ئەبەخشی‌و بە چاوی كەم تەمەشا ئەكرێت‌و شەرم‌و حەیا دای ئەگرێت.

### ٣- سـزادان بە بـەرد بـاران :

ڕەخنەیێکی دیکە کە لە ئایین وەرگەڕاوەکان لـە ئـایینی ئیـسلامی ئەگرن ئەوەیە کە ئەڵێن: ئەم ئایینە لە زینادا ڕێ بە ڕەجم کردن ئـەداو ئەڵێن ئەم سزادانە دورە لە هەمو دادپەروەریەك کە بیـەوێت بەیـداغی عەدالەت بەسەر کۆمەڵو وڵاتدا بەرز بکاتەوە.

ئەوەی کە لەمەوپێش دەربارەی سـزای زینـا باسمـان کـرد هـەروەکو زانیمان مەبەست پێی ئەو زینایەیە کە لە بەینی مرۆڤێکی بێ هاوسەرو ئافرەتێکی بێمێرد دێنە دی، واتەکە هەر دولایان ڕەبەن بن.

بەڵام ئەگەر هـاتو مرۆڤێکـی خـاوەن هاوسـەر لەگـەڵ ئـافرەتێکی مێردار یەکیان گرتو ئەو کـارە خەراپـەیان هێنایـەدیو کردەوەکـەیان بەشایەدی چوار شایەدو بەو شێوەیەی لەمەوپێش باسمان کرد لای قـازی دەرکەوتو ئیسپات بو سزاکەی ڕەجمی هەردو لایانە، چونکە ئەو مرۆڤە لەگەڵ ئەوەی هاوسەری هەیە دەست بۆ عەرزو ناموسیمێردی ئەو ژنەو کەسوکاری ژنەکە درێژ ئەکات، ژنەکەش لەگەڵ ئەوەی پێویـستی بـەو کارە نیە چونکە مێردی هەیە خۆی بۆ ئەو کابرایە نەرمو شل ئـەکاتو ئەبێتە شەرێك بۆ عەیبدارکردنی عـەرزو ناموسـی خـۆیو مێردەکـەی جگە لەوەی بەو خیانەتـەی بناغـەی نـەوەی مێردەکـەی بـزر ئـەکاتو لەگەڵ بناغەی نەوەی ئەوکابرایەی ئەو کارەی لەگەڵ دێنێتـە دیو ئـەو خیانەتە ئەکات لە ڕەحمیا تێکەڵاو ئەکات ئینجا بناغەی نەوە کە دوای بونی بە منـاڵێك نازاندرێ هی مێردەکەیەتی یان هی ئەو کابرایە یە.

سزا بە ڕەجم لە هـیچ ئایـەتێکی قورئـان فـەرمانی پـێ نـەدراوە، لـە تەراتاکە هی جولەکەکانە فەرمانی پێدراوە. بەڵام لە کتێبەکانی حـەدیس

ریوایەت هەیە کە لە کاتی پێغەمبەر ﷺ مرۆڤێـك کـە نـاوی مـاعیزی کوڕی مالك بووە خاوەنی هاوسەر بوە، هەروەها ئافرەتێك کە بە غامیدییـە ناوبراوەو مێردار بوە، هەر یەکە گوناهی زینایان لـێ روداوەو هەر یەکە بە ئارەزوی خۆیان زوبانی بە هێنانەدی ئەو کارەی جولاندوەو ئیعترافی کـردوەو داوای کردوە سزای ڕەجمی بەسەرا بدرێت، ئینجا بـەپێی ئـەو داوا کردنـەی ویستی هاتۆتە دی.

لەوەی کە رامانبورد لەمەوپێش زانیمان کە زینا بە شـایەدی چـوار شایەدی راستگۆی خوداناس ئیسپات ئەبێت ئەگەر بەو شێوەیەی باسمان کرد شایەدی بدەن کە ئەو کارە هێنانەدییەیان بە چـاوی خۆیـان دیـوە. هەروەها دەرمان خست کە ئیسپات بوونی روودانی ئەو کارە بە شایەدی شایەد زۆر زەحمەتەو نایینە دی، چونکە هیچ ئافرەتێك‌و هیچ مرۆڤێکی مسوڵمان لە وڵاتێکی ئیسلامی هەر چەندێك بێ شەرم‌و بێ حەیاو بـێ ئابڕو بن ئەگەر روبکەنە هێنانەدی ئەوکارە زۆر بە دزی‌و بەنهێنی رووی تێئەکەن تا هیچ کەسێك ئاگـاداری نـەبێت‌و نـەی بینـێ‌و کارەکـەیان شایەدی لەسەر نەبێت.

ئەشێت یەکێك بڵێت ئەی کەوابێت ئەم سزایە بـۆ بڕیـار دراوە؟ لـە وەڵاما ئەوترێت بۆ ئەوەی باش بزاندرێت هێنانەدی ئەو کارە ڕووتێکردنی کارێکی زۆر خەراپە، لە لای خودا زۆر گەورەیەکە سزاکەی ئـەبێت ئـەم سزایەبێت کە خەڵکی لـێ ئەسڵەمێتەوەو خۆیانی لـێ لا ئەدەن.

ئنجا کەوابێت رەخنەی ئەو لە ئایین وەرگەڕاوانە رەخنـەیێکی پوچـی بێ جێیەو هیچ سەنگ‌و نرخێکی نیـە کـە ئەوانـە وائەیخەنـە بەرچـاو

ئەگەر کۆمەلایەتی‌و ولات بە پێی ئایینی ئیسلام بەڕێوە ببردرێت هەر جارەی چەند کەسێك ئەبێت توشی سزای رەجم ببێت.

ئەو لە ئایین وەرگەڕاوانەو خاوەن رەخنانە ئەگەر راست ئەکەن با لەو رۆژەی کە خودا ئادەمیزادی بە ئایینی ئیسلام شەرەفدار کردوە لە کاتی پێغەمبەر تا ئەوکاتەی پشت کراوەتە یاسای ئەم ئایینە – واتە لە نزیکەی چواردە چەرخ – یەك کردەوەمان بۆ دەر بخەن کە یەکێك – نالێم چەند کەسێك – بە شایەدی سزای رەجم رووی تێکردبێت، ئەوە مێژوو لەبەر دەستیانە با نمونەییکمان بۆ دیار بکەن.

ئێمە لە باسەکەی پێشو باسمان کرد زینایێك کە سزاکەی دارکاری بێت بە ئیعترافێکی دور لە خورتی لێکردن لای قازی ئیسپات ئەبێت، هەروەهاش زینایێك کە سزاکەی رەجم بێت بەم شێوەیە دەرئەکەوێت‌و ئاشکرا ئەبێت. ئەمەش زۆر زەحمەتە یەکێك ئەو کردەوەی خۆی لای قازی دەربخات‌و دەمی پیا بێنێت تا ئەو سزایە ڕووی تێبکات. ئەمە نەك هەر زەحمەتە بەڵکو رودانی لە مەزەندەدا نیە.

پێشتر باسمان کرد کە ئایینی ئیسلام ئەیەوێت رودانی ئەو کارە تا بکرێت پەردەی بەسەرا بدرێت. ماعزی کوڕی مالك کە ئەو کارەی لێ ڕوداو لای پێغەمبەر دەمی پیاهێنا، پێغەمبەر ویستی ئیعترافەکەی زەدەی تێبکەوێت تا سزای رەجم رووی تێنەکات، پێی فەرمو ئەشێت ئەوکارەت نەکردبێت هەر دەست کورتیت کردبێت‌و یان هەر ماچت کردبێت سی جار لەو جێیەی لێی بون ماعزی دورخستۆتەوە تا بەڵکو لە ئیعترافەکەی لابدات بەلام ماعز هەر لەسەر قسەی خۆی سور بوە، ئنجا کە دەست کرا بە رەجمی، رایکرد، ئەوانەی رەجمیان ئەکرد دوای

کەوتن، پێغەمبەر فەرموی ئەبوایە وازتـان لێبهێنایـە بـەڵکو تۆبـەی ئەکردو خودا تەوبەکەی لێوەرئەگرت.

ئافرەتی غامیدیە ناویش کە لای پێغەمبەر دەمی بەو کردەوە خەراپـەی خـۆی هێنـا، پێغەمبـەر ﷺ ڕوگـرژی نیـشاندا پێـی فـەرمو بـڕۆ لـە ئیعترافەکەت بکەرەوەو تۆبە بکـەو ڕووت بـە لای خـوداوە وەرگێـڕە، بـەڵام ئافرەتەکە هەر سوور بو لەسەر ئیعترافەکـەی ووتـی ئایـە ئەتـەوێت دورم بخەیتەوە هەروەکو ماعزی کوڕی مالکت دورخستەوە.

ئنجا لەبەر ئەم شەرعا ئەو کەسەی لە لای قازی ئیعتراف بەو کردەوە خەراپەی خۆی ئەکات ئەبێت چەند جارێك لە چەند دانیشتنێکی قازیـا سوربێت لەسەر قسەی خۆیی‌و پەشیمانییەکی تێدانەبێت. قازی ئـەبێت بە شێوەیێك بیدوێنێ کە هاندانی تیا بێت بۆ لادانی لە ئیعترافەکەي تا ئەو سزایە روونەدات .

ئەگەر هات ئەو کەسە، هەر ڕشـت بـو لەسـەر قـسەو ئیعترافەکـەی، قازیش حوکمی بە سزادانەکەدا کابرا بۆی هەیە دوای ئەوەش لە قـسەکەی پەشیمان ببێتەوە بڵێت ئیعترافەکەم راست نیەو درۆی تێدایە، قازی ئـەبێت ئەوەی لێوەربگرێت‌و حوکمەکەی هەڵبوەشێنێت‌و سزاکە روونەدات.

## ٤- سـزای دزیکـردن :

دزی کـردن کارێـك‌و کردەوەیێکـی زۆر خەراپـە، خەراپییەکـەی روو ئەکاتە ئـەو کەسـەی دزیەکـەی لێنـەکرێت، هـەروەهاش روو ئەکاتـە کۆمەڵایەتی وڵات.

تەمەشا ئەکەیت یەکێك بە هەمو توانـاییکی روو ئەکاتـە ئیـشکردن و کاسبی بۆ ئەوەی ژیانی باش بـۆ خـۆیی‌و مـاڵ‌و منـداڵی برەخـسێنێ، بـەو هەوڵدانەی ماڵ و سامانێکی مناسب دەسگیر ئەکات‌و تفاقێکی جوان‌و ڕێك بۆ ماڵەکەی ئەرەخسێنێ. کاتێك بەیانییك کە لەخـەو هەڵئەسـتێ تەماشـا ئەکات بە شەو یەکێك رووی کردۆتە ماڵەکەی‌و بـە شـێوەیێك توانیویـەتی دەرگای ماڵەکەی بکاتەوە، ئەوەی تیا بەنرخـەو دەسـتی گەیـشتبێتێ‌و بـۆی لوابێت لە پارەو خشڵی ئاڵتونی هاوسەرەکەی دەسی پیا هێناوەو دزیویـەتی، ئنجا چ بە تەنیا بوبێت یان شەریك و یارمەتی دەری بوبێت.

کابرای خاوەن ماڵ بەداخێکی زۆرەوە ئەبینێت رەنجـی کـاتێکی زۆری لەدەست چوەو دزە هەروا بە ئاسانی و بەبێ هـیچ مانـدوبونێك دەسـتی بەسەرا گرتوەو بردویەتی.

وابوە دزێك رووی کردۆتە ماڵێك تا ئـەوەی تیایـەتی‌و ئەیـەوێت بـە ئاسانی‌و بەبێ تەگەرە بکەوێتە ژێردەستی‌و، خاوەن ماڵەکەی کوشـتوە. واشبوە خاوەن ماڵەکە کە بەخەبەر هاتوە تەماشای کردوە توانای ئەوەی نیە بەرەنگاری دزە ببێت ئنجا رێی بۆ رەخساندوە تا چی ئەوێت بببات، بەڵام لەگەڵ ئەمەشا دزە دەستی کوشتنی بـۆ درێـژ کـردوەو هەناسـەی لـێ بڕیوە لەبەر ئەوەی نەبادا خاوەن مـاڵ بیناسـێت‌و دوایـی خەبـەری لێبداو دزینەکەی دەربکەوێت.

دزی جگە لەوەی زیان‌و ناخۆشی بە خاوەنی ئەو ماڵـە ئەگـەیێنێ کە دزیەکەی تیا ئەکرێت، ناخۆشی‌و ئاشوب لە نـاو کۆمـەڵ پەیـدا ئەکات، چونکە هەمو کەسێکی تیا ئەخاتە ترس‌و دڵنارەحـەتی لـە

ترسی ئەوەی نەبادا دزێك زەفەر بە ماڵەكەی بەرێتو زیان بە خۆی یان بە ماڵەكەی بگەیێنێ.

ئایینی ئیسلام بۆ بەرامبەر وەستانی ئەم كارە خەراپە زیانو ترس بەخشە لە مەچەكەوە دەست بڕینی بۆ دزی داناوە.

خودا لە قورئانی پیرۆزا لە ئایەتی (٧) لە سورەتی (المائدة) ئەفەرموێت: ﴿وَالسَّارِقُ وَالسَّارِقَةُ فَاقْطَعُواْ أَيْدِيَهُمَا جَزَاء بِمَا كَسَبَا ....﴾، واتە: دز چ مرۆڤ بێت یان ئافرەت بەرامبەر دزینیانو ئەم كردەوە خەراپە یان دەستیان ببڕن، تا ببێتە عیبرەت بۆ خەڵكی دیكە كە ئەیانەوێت ڕوو لەم پیشە خەراپە بكەن.

لە ئایین وەرگەڕاوەكان لێرەشا بە ڕەخنە تەماشای ئەم بڕیاردانە ئەكەنو ئەڵێن چ ڕەوایە دەستی دز ببڕدرێت؟ رووكردنە ئەم سزادانە ئازاری توندو زۆرو دڵرەقی تێدایە، یاسا نابێت بڕیاردانی ئەم شێوە سزایەی تێدابێت، هەروەها ئەڵێن: دز هەر ئەبێت حەبس بكرێت بۆ ماوەیێك كە رێك بێت لەگەڵ ئەو دزیەی كەوا كردویەتی.

ئەوانە ئەم بڕیاردانەیان وەكو ئەوە وایە یەكێك بن هەردو چەنەگەی پەنمابێت پێویستی بە پەنسلین هەبێت، یەكێك خۆی بە دكتۆر بزانێتو بڵێت ئەمە بە حەبی ئەسپرین چاك ئەبێتەوە.

ئەوانەی لایانوایە سزای دزی ئەبێت هەر حەپس كردنبێت ئەگەر نەختێك بە باشی وردببنەوەو بە رێكی بیر بكەنەوە ئەبینن كە لە ڕاو تێگەیشتنیان بە هەڵەیا چوون. ئەوانە لە بەغدا ئەگەر تەماشای دەفتەری پۆلیس خانەكان بكەن كە روداوی ئەوانەی دزیانكردوە تیا دەرخراوەو ژمارداوە، ئەبینن هەر یەكە لەوانە چەند جارێك لەبەر دزی

کردن‌و گیرفانی خەڵك بڕین ڕوی پێکراوەتە حەپسخانەو ماوەییەك تیا ماوەتەوە، ئنجا کە بەردرابێ هەر هەڵی بۆ ڕێك کەوتبێت جارێکی دیکە ڕوی کردۆتەوە ئەو پیشەیەی خۆی، چونکە حەپسکردن هیچ جارێك ئازارێکی پێنەگەیاندوە تا ببێتە هۆی ئەوەی لەو پیشەیەی لایبدات، کە بەریش درابێت‌و سەرفراز کرابێت هیچ نیشانەییەکی پێوەنیە وەك دەست بڕین تا لەناو خەڵك‌و کۆمەڵا خەجاڵەتی بکات‌و شەرم بیگرێت‌و بۆی ببێتە عیبرەت تا جارێکی دیکە ڕووی بە لای ئەو کردەوە چڵکنە وەرنەگێڕێ.

هەروەهاش ببێتە عیبرەت بۆ کەسێکی دیکە کە بیەوێت ڕێی ئەو پیشەیە بگرێت. بۆیی ئەبینین دزی لە هەمو وڵاتەکان کارێکی بڵاوو ڕوتێکراوە، ئنجا بۆ ئەو ڕوتێکردنە چەندەها فێڵ و فێڵکاریان دۆزیوەتەوە تا بە باشی‌و بە مسۆگەری سەرکەوتنی ئەو ڕوتێکردنەیان بێتە دەست.

بەڵام ئەگەر سزای دزی ئەو سزادانە بێت کە خودای بەرزی بێوێنە فەرمانی پێداوە ئەگەر دزی لەناو کۆمەڵ‌و وڵاتا بە تەواوی بنبڕ نەبێت، ڕووتێکردنەکەی زۆر کەم ئەبێت، چونکە زۆر لەوانەی ئەیانەوێت دزی بکەن لێی ئەسڵەمێنەوە، چونکە ئەزانن ئەگەر دزیەکەیان ئاشکرا بێت دەستیان لە کیس ئەچێت، لەگەڵ ئەمەشا ئەگەر یەکێك بەمە نەسڵەمێتەوەو ڕێی لێ نەیگرێت‌و دزی بکات‌و لێی دەربکەوێت‌و دەستی ببردرێت جارێکی دیکە ڕوو لەو ڕێیەناکات، خەڵکی دیکەش لەناو کۆمەڵا کە ئەوە ئەبینن، ئەوەی بیەوێت ئەو ڕێیە بگرێت چۆنها نەبێت خۆی لێ لائەدات، چونکە ئەزانێت دەستی خۆی لە کیس ئەچێت‌و لەناو خەڵکیشا بە چاوێکی نزم‌و کەم تەمەشا ئەکرێت.

وڵاتی حیجاز (سعودیە) پێش ئەوەی نەوتی تیا دەربکەوێت لە وڵاتە زۆر فەقیرەکان ئەژمێردرا، بەشی زۆری دانیشتوەکانی گەلێك هەژارو دەست کورت بون، لەگەڵ ئەمەشا دزی تیا زۆر کەم روی ئەدا، چونکە ئەوەی ویستنێکی دزی ببوایە لەبەر دەست بڕین خۆی بەلایەوە نە ئەبرد هەروەکو ئەمە ئێستاکە وایە.

ئەوانەی وا ئەزانن ئەگەر لەبەر دزی سزای دەست بڕین لە قانونی وڵاتا هەبێتو بڕیاری لەسەر بدرێت هەر ماوەییكو ماوەییك ئەبێت لە ناو کۆمەڵا چەند دەستێك لە مەچەکەوە ببڕدرێتو دەست براوانی بە زۆری تیا بدیترێت.

بەلاّن وانیە چونکە ئایینی ئیسلام لەبەر دزی هەروا بە ئاسانی بڕیاری دەست بڕین نادات، ئێمە ئەگەر تەمەشای کتێبە شەرعیە درێژە پێدراوەکان بکەین ئەبینین نزیکەی بیست شەرت بۆ دەست بڕین هەیە، یەکێك لەو شەرتانە لارێیکی تیا رووبدات دەست نابڕدرێت.

ئیمامی ئیبنو حەجەر ئەڵێت: بە درێژایی حوکمی ئیسلامی لە وڵاتانی ئیسلاما تەنیا لەبەر دزی شەش دەست براوە.

ئەمە لەبەر چی وابوە؟ لەبەر دوشت، یەکەمیان: بڕیاردان بە دەست بڕین لە هەمو ئەو ماوەیە بۆتە هۆی ئەوەی دزی کەم رووبدات، دوەمیان: ئەوەیە کە بەشی زۆری ئەو دزیانەی ڕوویدابێت شەرتی دەست بڕینی تێدانەهاتۆتە دی تا دەست ببڕدرێت.

وتمان لە دزیا بۆ دەست بڕین نزیکەی بیست شەرت هەیە، ئەم شەرتانە هەندێکی پەیوەندی بە دزەوە هەیە هەندێکی دیکەی پەیوەندی بەو شتە هەیە کە ئەدزرێت، هەندێکی دیکەی پەیوەندی بەو

کەسەوە هەیە کە دزیەکەی لێ ئەکرێت، هەندێکی دیکەشی پەیوەندی بەو جێیە هەیە کە دزیەکەی تیا ئەکرێت.

ئێمە لێرە ناتوانین ئەم شەرتانە روون بکەینەوەو بیانخەینە بەر چاو تەنیا شەرتێکیان نەبێت، ئەمەش ئەوەیە، ئەگەر یەکێك نەبونی و برسیەتی هەڵی بگرێتە سەر ئەوەی دزی بکات سزای دەست بڕین ڕووی تێ ناکات.

خودا لە ئایەتی (۱۷۳) لە سورەتی (البقرة) ئەفەرموێت: ﴿فَمَنِ اضْطُرَّ غَيْرَ بَاغٍ وَلاَ عَادٍ فَلا إِثْمَ عَلَيْهِ﴾، واتە: هەر کەسێك زەرورەت رووی تێبکاتە هێنانەدی کارێکی حەرام، گوناهێکی پێناگات .

لەم رووەوە ڕووداوێکی زۆر بڵاو هەیە کە لە گەلێك کتێبەکان باسکراوە، ئەمەش ئەوەیە کە لە کاتی خەلیفەی دادپەروەری دووەم جەنابی عومەری کوڕی خەتتاب نەهاتیو گرانییەکی زۆر روویکردە وڵاتی حیجازو برسیەتی رویدا، چەند کەسێك لە کۆیلەکانی حاتەبی کوڕی ئەبو بەلتەعە حوشترێکیان لە مرۆڤێکی موزەینەیی دزیو سەریانبڕیو گۆشتەکەیان خوارد، کە دزیەکەیان لێ ئاشکرا بو، لای جەنابی عومەر دانیان بە کردەوەکەی خۆیان هێنا، جەنابی عومەر بڕیاریدا دەستیان ببڕدرێت، بەڵام کە زانی برسیەتی ئەو ڕێیەی پێیان گرتوەو شەرتی سزای دەست بڕینیان بە سەرا نەهاتۆتەدیو برسیەتی ئەو کارەی پێ کردوون، بڕیارەکەی خۆی وەستاند، ئنجا بە حاتەبی کوڕی ئەبو بەلتەعەی گوت تۆ ئەوانە کە نۆکەرتن باش نان نادەیتو برسیان ئەکەیت کە ئەوە وایکردوە ئەو دزیە بکەن، سوێندم وابێت ئەبێت لە سزای ئەوە تۆ نرخی حوشترەکە دو چەندانە بدەیت. ئنجا ئەو نرخەی پێ بژارد.

ئەوانەی دەست بڕین لەبەر دزی کردن بە سزایەکی خەراپ ئەخەنە بەرچاوو سۆزیان ئەجولێ بەرامبەر ئەو دەستە بێنرخانەی لەبەر دزی ئەبڕدرێت، بیر لەوە ناکەنەوە کە دزی کردن ئەمن و ئاسایشی وڵات ئەشێوێنێ و زۆر خراپەی تری لێ ڕوئەدات لە کوشتن و بریندارکردن و داگیرکردنی ماڵ و سامانی ئەوانەی بە ئارەقەی ناوچەوانی خۆیان و کاسبی ئەو ماڵ و سامانەیان پێك هێناوە.

ئایە کامە باشترە سزای دەست بڕین نەبێت و دز ترسی ئەوەی لە دەست چونەی لا نەبێت و چۆنی ئەوێت وا ڕو لە دزین بکات و دەست بخاتە سەرماڵ و کاسبی خەڵك، یان ئەو سزایە لە قانونا هەبێت تا دز لە دزی کردن بڕەوێنێتەوەو لەناو کۆمەڵا هەمو کەسێك دڵنیا بێت لەوەی زیان بە خۆیی و ماڵ و سامانی ئەوانەی بە ئارەقەی ناوچەوانی خۆیان و ڕوکردنە کاسبیان ئەو ماڵە ناگات بە دڵنیایی،کە شەوان سەر بخاتە سەر سەرینەکەی بەبێ ئەوەی ترسی هەبێت دزێك شەوێك لە شەوان ڕو ئەکاتە ماڵەکەیی و زیانی پێ ئەگەێنێ.

هەمومان ئەزانین کە لە کاتی حوکمی بەعس و حوکمی ڕەشی صەدام بە تایبەتی لە ساڵەکانی شەڕی عێراق و ئێران و دوای ئەو ساڵانە لە بەغدا پەتی ئەمن پچڕابوو دزێیکی زۆری تێدا بڵاو بوبۆوە، بە شێوەییك کەس لە ماڵی خۆی ئەمین نەبو کە شەوێك دزێك یان چەند دزێك روبکەنە ماڵەکەیی و ئەوەی تیایەتی فەرهودی بکەن، هەندێك لەو دزانە دزییان کردبوە سەنعەت بۆ ئەوەی ڕۆژ بە ڕۆژ گیرفانی خۆیان زیاتر پڕ بکەن.

هەندێك لەوانە پیشەیان ئۆتۆمبێل دزین بو تا پارچەی مەکینەکانی لە بازاڕی ڕەشا بفرۆشن، هەندێکی دیکەیان لە تاریکایی نیوە شەوا ڕوویان ئەکردە ماڵان، دەرگاکانیان بە فێڵێك ئەکردەوەو ئەوەی بە نرخ بوایەو بکەوتایەتە ژێر دەستیان تاڵانیان ئەکرد.

بەڵێ وابوە لەو کاتانە چەند دزێك گیراون‌و بۆ ماوەیێك حەپس کراون بەڵام کە بەردراون ڕوویان کردۆتەوە پیشەکەی خۆیان.

بەڵان ئەگەر بهاتایە لە یەکەم ڕۆژەوە دوودەست لە دەستی ئەو دزانە ببڕدرایەو ئەو بڕینەیان بە تەلەفزیۆن دو سێ جار نیشان بدایە لەسەدا هەشتای ئەو دزیانە روی نەئەداو هەمو خەڵك لە ماڵ‌و حاڵی خۆی دڵنیا ئەبو.

٥- سزای لە ئایین وەرگەڕان :

لە ئاین وەرگەڕاوەکان رەخنەیێکی دیکەی کە لە ئایینی ئیسلام ئەگرن‌و دەم درێژ ئەکەن، ئەڵێن: هەمو کەسێك ئەبێت سەربەست بێت لە بیروباوەڕی خۆی، چۆنی ئەوێت باوا بڕوا بکات‌و تێبفکرێ، یەکێك ئەگەر پشتی کردە ئەو بیروباوەڕەی کە باوکی مسوڵمانی لەسەری بووەو پێیگەیشتوە بە ڕاستی نەزانی‌و بڕوای پێنەکات بۆ چ ئەبێت ئەم ئایینە بڕیار بە سزادانی بدات، ئایا چۆن ئەبێت مرۆڤ بە زۆرداریی بە بیروباوەڕێکی تایبەتی بەند بێت‌و نەتوانێت خۆی لێ جیا بکاتەوەو ڕوو بکاتە بیروباوەڕێکی دیکە، یان بێباوەڕی.

بەڵێ مرۆڤی مسوڵمان مسوڵمانیەتەکەی چ لە باوکیەوە پێگەیشتبێ، یان لەسەر ئاینێکی دیکە بوبێت‌و دوایی مسوڵمان بوبێت بۆی نیە خۆی لە مسوڵمانەتیەکەی لابدات‌و خۆی لێ

بتەكێنێتەوە، ئنجا چ ڕو بكاتە ئایینێكی دیكە یان هەر بەبێ ئـایینی بمێنێتەوە، ئەو مسوڵمانەی پشت بكاتە ئایینەكەیی‌و خۆی لـێ لابدات‌و پێی ئەوترێت لە ئایین وەرگەڕاو.

مرۆڤی مسوڵمان لە ئایین وەرگەرانی‌و بونی بە كافر بە چەند شتێك ڕو ئەدات وەكو ئەوەی بڕوای بـە بـونی خـودا نـەبێت، یـان بـڕوای بـە پێغەمبەرایەتی پێغەمبەرو پێغەمبـەرەكانی دیكـە نـەبێت ـسـەلاوی خودایان لەسەر بێت- یان وابزانێت قورئان لە لایەن خوداوە نیـە، یـان بڕوا بە واجب بونی نوێژ ئەكات‌و، هەروەها فەرزەكانی دیكـە، یـان بـە قسە یان بە نوسین یان بە وتار لە ئێزگەیێكا بە گـژ ئـایینی ئیـسلاما بچێت‌و لایێكی بە خەراپ بخاتە بەرچاو و هەر شـتێكی دیكـەی وەكـو ئەمانە كە بۆنی كافربونی لـێ ڕوبدات.

بەلآن ئەبێت بزانین ڕەخنەگرتن لـە هەنـدێك قـسەی مامۆسـتایانی پێشوی ئایین هەرچەندێك پایەی زانیاریان بەرز بوبێت، كە دامـەزرابێت لەسەر ئیجتیهادو تێروانی خۆیـان شـتێكی دیكەیـەو دروسـتەو هـیچ گوناهێك نابەخشێ، هەروەها ئەبێت بزانین ئەوەی لەسەر ئایینێكی دیكە لەدایك بوبێت بڕوای چۆن بێت، كەیفی خۆیەتی، لە ئایین وەرگـەڕان ڕو لەو ناكات.

مرۆڤی مسوڵمان ئەگەر لە ئایینەكەی وەربگەڕێت، بـەو شـێوەیەی كە نەختێكی دیكە باسی ئەكـەم، سـزاكەی كوشـتنە. پێغەمبـەر ﷺ فەرمویەتی: (مَن بدَّل دینه فـاقتلوه)، واتـە: هـەر مـسوڵمانێك لـە ئایینی خۆی لابدات‌و لێی وەربگەڕێت بیكوژن.

خودای بەرزی بێوێنە لە قورئانی پیرۆزا لە ئایەتی (٢١٧) لە سورەتی (البقرة) ئەفەرموێت: (وَمَن يَرْتَدِدْ مِنكُمْ عَن دِينِهِ فَيَمُتْ وَهُوَ كَافِرٌ فَأُوْلَـئِكَ حَبِطَتْ أَعْمَالُهُمْ فِي الدُّنْيَا وَالآخِرَةِ وَأُوْلَـئِكَ أَصْحَابُ النَّارِ هُمْ فِيهَا خَالِدُونَ)، واتە: ئەی مسوڵمانینە هەر کەسێك لە ئێوە لە ئایینەکەی وەربگەڕێت بەبێ ئەوەی تۆبە بکاتو بگەڕێتەوەو بە کافری بمرێت، ئەوە هەمو کردەوەێیکی، فەوتان ڕووی تێئەکاتو لە دونیاو لە دوارۆژ سودێکی لێوەر ناگرێت، ئەو کەسە لە دوارۆژا هاوڕێی ئاگری دۆزەخەو بە بێ کۆتایی تیا ئەمێنێتەوە.

- بەڵێ پێغەمبەر ﷺ فەرمویەتی: ئەو مسوڵمانەی لە ئایینەکەی وەرئەگەڕێت بیکوژن.

ئنجا با بزانین مەبەست لەم فەرمانە کێیەو لە ئایین وەرگەڕاوەکان کێ ئەگرێتەوە، هەروا بۆمان دەربکەوێت لە کاتی پێغەمبەرا چ شێوە لە ئایین وەرگەڕاوێك لەناو کۆمەڵا ڕویداوە، هەرواش بزانین پێغەمبەر ﷺ بۆ ئەم فەرمانەی داوە.

لە ئاین وەرگەڕاوان لەسەر دو بەشن. بەشێکیان زیانی لە ئایین وەرگەڕاوەکەیان هەر بۆ خۆیانەو ڕوناکاتە کەسێکی دیکەو ئەو کۆمەڵەی تێدا ئەژین. ئەو بێبڕواییەی ڕویان تێکردوە بڵاوی ناکەنەوە چ بە قسەو وتار بێت یان بە قەڵەمو نوسین بێتو هیچ ڕەخنەیێکیان لە ئایینی ئیسلام لێ نایبسترێتو مەزەندەی ئەوەیان لێناکرێت هیچ بەندایەتیێکیان لەگەڵ بەشێك یان وڵاتێك هەبێت کە بە دوژمنایەتی تەمەشای مسوڵمانەکانو ئایینی ئیسلام ئەکەن. ئەم شێوە کەسانە بە هیچ خەلاپێیك ڕویان تێناکرێت، چونکە بێ زیانن.

بەڵان بەشێکی دیکەی لە ئاین وەرگەڕاوەکان زیانەکەیان وەنەبێت هەر بۆ خۆیان بێت، بەڵکو ڕوئەکاتە بیروباوەڕی مسوڵمانەکانو ئەیانەوێت ئەو بێباوەڕیەو لە ئایین وەرگەڕانە یان لەناو میللەتا بە قسەو وتارو قەڵەمو نوسینو نوسین کاری بڵاوبکەنەوەو ئایینی ئیسلام یان هەندێك لە فەرمانو فەرمایشتەکانی کە ڕاستیەکەی هیچ گومانێك روی تێناکات بە غەڵەت بخەنە بەرچاوو بە گژیا بچنو ڕەخنە لە هەندێك لە فەرمایشتەکانی پێغەمبەرو رووتێکردنەکانی بدەنو بە بێئەدەبی دەمی بۆ درێژ بکەن.

ئەم شێوە لە ئاین وەرگەڕاوانە ئەبێت بەرامبەریان بوەسترێتو ڕێی وتارو کردەوەی خەراپیان لەناو کۆمەڵو وڵاتا لێببڕدرێت، ئەوانە ئەو فەرمانەی پێغەمبەریان ﷺ بەسەرا بڕیار ئەدرێت، نەك بەشی یەکەمیان، چونکە ئەمانە لە ئاین وەرگەڕانەکەیان لە بیروباوەڕی ئایینی ئیسلامو هەمو مسوڵمانەکان یاخی بونەو بە گژیا چونەو دوژمنایەتی نواندنە لەگەڵ قانونو دەستوری هەمو میللەتێکی مسوڵمانو گەورەترین خیانەتە بەرامبەریانو بەرامبەر ئایینی ئیسلام.

ئنجا ئایە چ میللەتێك و وڵاتێك و دەوڵەتێك بە خیانەتکردن لەگەڵ سیستەمو قانونو دەستوریا قایل ئەبێتو بەرامبەری زۆر بەتوندی ناوەستێت؟

قانونی هەمو وڵاتێك لە عالەما هەر کەسێك بەرەو ڕوی قانونو دەستوریا بوەستێت بڕیاری ئیعدام کردنی ئەدات، چونکە رووتێکردنی گەورەترین خیانەت دا ئەندرێت.

بونی ئەم بەشە لە ئایین وەرگەڕاوانەکە دوژمنی ئایینی ئیسلامن ڕێپێدانیانو ڕێ لێنەگرتنیان کارێکی زیان بەخشە، ئەوانە هیوایان تیا

ئەبێت کە بە نهێنی بەندایەتی لەگەڵ وڵاتێکی دوژمنی غەیرە ئاین پەیدا بکەن‌و کاری شاردراوەی وڵاتی خۆیانیان بۆ دەربخەن.

ئەمە ئێستاکە لە فەڵەستینا ڕوودەدات، هەندێك لەو لە ئایین وەرگەڕاوانە تیا بۆ ئیسرائیل جاسوسی ئەکەن، چاویان لە شارەکانا بەسەر ئەوانەوەیە کە پێشەوان‌و دەوڵەتی عیبری ئەیەوێت لەناویان بەرێت، ئنجا وائەبێت یەکێك یان چەند کەسێك لەو پێشەوانە کە بە ئۆتۆمبێل ڕووئەکەنە شوێنیك یەکێك لەو لە ئایین وەرگەڕاوانە بە تەلەفۆنی مۆبایل بە چاپوکی ئەمە بە جێیی تایبەتی ئیسرائیل ئەگەێنێ، ئنجا بەبێ دواکەوتن فڕۆکەیەك دێت‌و ئەو ئۆتۆمبێلە بەر ساروخ ئەدات‌و ئەوەی تیایەتی ئەیسوتێنێ. ئنجا ئایە ئەم شێوە لە ئایین وەرگەڕاوە کوشتنی بۆکەم نیە؟

وابوە کە ئایینی ئیسلام سێبەری بەسەر وڵاتەکانیا بووەو دوژمنایەتی لەگەڵ دەوڵەتێکی غەیرە ئایین بوە، یەکێك لەم شێوە لە ئایین وەرگەڕاوانە پێش ئەوەی هەستی پێبکرێت‌و دەستی دادگای بۆ درێژ بکرێت ڕای کردوەو چۆتە لای ئەو دەوڵەتە دوژمنەو هەر کارێکی نهێنی مسوڵمانەکانی لابوبێت بە وانی گەیاندوە.

لە کاتی پێغەمبەر ﷺ یەك دوکـــــاری وا رویداوە، یەکێك لە مسوڵمانەکانی مەدینە کە چرای ئیمان لە دڵیا کزبووەو ڕوو لە کوژانەوە بووە یەکێکی کوشتوەو لە ئایین وەرگەڕاوەو رایکردۆتە ناو بت پەرستەکانی مەککە کە دوژمنی ئایینی ئیسلام‌و پێغەمبەرو مسوڵمانەکان بون، ئنجا بێگومان چی لابوبێت دەربارەی هێزو توانای مسوڵمانەکان‌و کاری

دیکەیان بە وانی گەیاندوە. ئنجا بۆیی ئەبینین پێغەمبەر ﷺ فەرمانی بە کوشتنی ئەم شێوە لە ئاین وەرگەڕاوانەی داوە.

ئیمامی نەخەعیو ئیمامی سوفیانی سەوری ڕایان وایە کە لە ئایین وەرگەڕاو ناکوژرێت بەڵام حەپس ئەکرێت. ئەشێت مەبەستی ئەم دوئیمامە ئەو لە ئایین وەرگەڕاوانە بێت کە خاوەنی زیانی زۆر نەبنو لەوانە بن بتوانن زەدە بە بیروباوەڕی خەڵك بگەیێنن. هەروەکو ئیمامی ئەبو حەنیفە لای وایە ئافرەتێکی مسوڵمان ئەگەر لە ئایینەکەی وەربگەڕێت ناکوژرێت بەڵام حەبس ئەکرێت تا تۆبە ئەکاتو لەو وەرگەڕاوییەی وەرئەگەڕێتەوەو ڕووئەکاتە ئایینەکەی، ئەڵێت: چونکە لە ئایین وەرگەڕانەکەی زیانێکی وای نابێت تا پێویستی بە کوشتن ببێتو ترسی ئەوەی لێناگرێت ڕووی بە لای دوژمنەوە بە رێتو دوژمن سودێکی لێ وەربگرێت.

خەلیفەی دووەمی دادپەروەر عومەری کوڕی خەتاب لای وایە لە ئایین وەرگەڕاو سزاکەی بە پێی زۆریو کەمی ئەو زیانەیە کە لێی ڕوئەدات بڕیارئەدرێت، هەروەکو خاوەنی تەفسیری (المحرر الوجیز) ئیبنو عەطیە لە لێکدانەوەی ئەو ئایەتەی کە لە سەرەتای ئەم باسە خستمانە بەرچاو ئەڵێت.

پێش ئەوەی دەست لەم باسە بەربدەم، پێویستە چەند خاڵێك بخەمە بەرچاوو بە کورتی لێیان بدوێم.

١- لە ئایین وەرگەڕاو ئەگەر پێویست بو بکوژرێت هیچ کەسێك ئەو هەقەی نیە، تەنیا سەرۆکی وڵات نەبێتو ئەوەی لە پایە دوای ئەو دێت، ئەبێت یەکێك لەم دوانە فەرمان بە کوشتنی بدات.

ئنجا ئەگەر یەكێك بەبێ فەرمانی فەرمانبەر ڕووی لەو كوشتنە كرد بە تاوانبار ئەژمێردرێت، بەڵام لەباتی ئەو كەسە ناكوژرێت، ئەبێت سزایێكی دیكەی بۆ بڕیار بدرێت، چونكە ڕووی لە كارێك كردوە كە هەقی ئەو نییەو هەقی كاربەدەستی وڵاتە.

٢- لە ئایین وەرگەڕاو پێش ئەوەی سزا بدرێت ئەبێت داوای لێ بكرێت تۆبە بكاتو لە ئایین وەرگەڕانەكەی وەربگەڕێتەوە، ئنجا ئەگەر پەشیمانی نواندو ڕووی كردەوە ئایینەكەی نابێت هیچ سزایێك ڕووی تێ بكرێت.

٣- هەر مسوڵمانێك لە ئایین وەربگەڕێت بێبەش ئەبێت لە میراتی خزمەكانی چونكە میرات وەرگرتن لە بەینی خزمان لەسەر بناغەی یەكبونی ئایینو یەكبونی بیروباوەڕ دامەزراوە، ئەوەی لە ئاینەكەی وەربگەڕێت بەینی لەگەڵ ئەو بناغەیە ئەپچڕێت كە میرات وەرگرتنی پێوە بەندە.

٤- مرۆڤی مسوڵمانی لە ئایین وەرگەڕاو بەینی لەگەڵ هاوسەرە مسوڵمانەكەی ئەپچڕێتو لەیەك حەرام ئەبن، چونكە یەكگرتنیانو حەڵاڵ بونیان بۆ یەكتری بە پێی ڕێدانی ئایینەكەیان بووە، جیابونەوەی مێردە لە ئاینەكەی ئەو یەكگرتنە هەڵئەوەشێنێو ئەیڕوخێنێو هاوسەرەكە بە تەڵاقدراوێكی سێ بە سێ ئەژمێردرێت، دوای تەواوبونی عیدەی ئەتوانێت شو بە یەكێكی دیكە بكات.

ئنجا هەر ئافرەتێكی مسوڵمان ئەگەر لە خودا بترسێت كە زانی مێردەكەی لە ئایین وەرگەڕاوە ئەبێت لێی جیاببێتەوەو بەینی یەكگرتنو جوتبونی لەگەڵیا نەمێنێت، وەگەرنا جوت بونەكەیان بە زینا دائەندرێتو سزادانی خودای بە دواوەیە.

## تێڕوانینـی ئیسـلام دەربـارەی ئـافـرەت

لە ئایین وەرگەڕاوەکان ڕەخنەیێکی کەیان لە ئایینی ئیسلام ئەوەیە کە ئەڵێن ئەم ئایینە ماف بۆ ئافرەت بڕیار نادات و بە چاوێکی کەم تەماشای ئافرەت ئەکات. ئەم ڕەخنەیان لە چەند ڕوویێکەوەیە.

(١) ئەڵێن لە شایەدییان لەسەر هەندێك کار دوانیان بە مرۆڤێك دائەندرێت.

(٢) لە کوشتنا شایەدییان وەرناگیرێت و بڕوایان پێ ناکرێت.

(٣) لە میراتا نیوەی بەشی پیاوی بۆ هەیە.

(٤) تەڵاق بە دەست پیاوەو بە دەست ئافرەت نیە.

(٥) ڕێی ئافرەت نادات ببێتە ئەندامی پەرلەمان و ببێتە وەزیر، هەروەها لای دروست نیە ببێتە سەرۆکی وڵات.

ئەم ڕەخنانەیان وەکو ئەو ڕەخنانەی کە لەمەوپێش پوچەڵیمان دەرخست ئەوا یەك بە یەك پوچەڵی و بێ‌نرخیان دەردەخەین و دەیخەینە بەرچاو دوای ئەم چەند قسەیەی کەوا ئەمەوێت پێشی بخەم.

پێش ئەوەی ئایینی ئیسلام بێت ئافرەت لە هەمو لایێکی جیهانا بە چاوێکی زۆر کەم تەماشا ئەکرا، لەبەرچاوو بە زانا ناسراو لە هەندێك وڵاتا گوماندار بون لەوەی کە ئافرەت وەکو گیانی مرۆڤ خاوەنی گیان بێت، وای بۆ ئەچون کە گیانی ئەو وەکو گیانی ئاژەڵەکانە.

بەشێك لە عەرەبەکان ئەگەر کچیان ببوایە زۆر پێی دڵتەنگ و عاجز ئەبون. لەم ڕووەوە خودای بەرزی بێوێنە لە ئایەتی (٥٨، ٥٩) لە سوڕەتی (النحل) ئەفەرموێت: ﴿وَإِذَا بُشِّرَ أَحَدُهُمْ بِالأُنثَى ظَلَّ وَجْهُهُ مُسْوَدًّا وَهُوَ كَظِيمٌ ۞ يَتَوَارَى مِنَ الْقَوْمِ مِن سُوءِ مَا بُشِّرَ بِهِ أَيُمْسِكُهُ عَلَى

هُون أَمْ يَدُسُّهُ فِي التُّرَابِ ...﴾، واتە ئەگەر یەکێك لەوانە پێیان بوترایە خێزانەکەت کچی بوە لە شەرما دەموچاوی گرژ ئەبوو تورەیی‌و ناخۆشی روی تێئەکردو لەبەر ئەم خەبەرپێدانە لە شەرما خۆی لە خەڵك دوور ئەخستەوەو نەیئەزانی چیبکات، ئایە بەسەر شۆڕی کچەکە بهێڵێتەوەو بەخێوی بکات، یاخود زیندە بە چاڵی بکات.

خودا دەربارەی خەراپی کردەوەی ئەوانەی کچەکانیان زیندە بەچاڵ ئەکرد لە ئایەتی(٨، ٩) لە سورەتی(التکویر) ئەفەرموێت: ﴿وَإِذَا الْمَوْؤُدَةُ سُئِلَتْ ۞ بِأَيِّ ذَنبٍ قُتِلَتْ﴾، واتە: ئەو کچانەی زیندە بەچاڵکراون باوکەکانیان لە دوارۆژدا ئەخرێنە ژێر پرسیار لێکردن، ئایە لەبەر چ گوناهێك ئەوانەتان زیندە بەچاڵ کردوە، واتە سزادان ڕوویان تێئەکات.

بەشێك لە عەرەبەکان ئەگەر یەکێکیان بمردایە ژنەکەی بە میرات ئەکەوتە دەست کەسوکارەکەی، نزیکترین کەسی ئەو مردوە بۆی هەبو ژنەکەی لە خۆی مارە بکات، ژنە بیویستایە یان نا، هەروەها بۆی هەبو ئەو ژنە بە مێرد بدات‌و مارەییەکەی بۆ خۆی وەربگرێ.

هەندێك لەو عەرەبانە ئەگەر یەکێکیان بمردایە کوڕەکەی لە ژنێکی دیکەی بۆی هەبو ئەو ژنە مارە بکات، ئەمە پێی ئەوترا (نکاح المقت).

ئایینی ئیسلام کە هات بە یەك چاو تەماشای پیاو و ئافرەتی کرد. خودای بەرزی بێوێنە لە چەند ئایەتێك ئەفەرموێت: ئافرەتمان لەو شتە هێناوەتەدی کە پیاومان لێی دروستکردوە، بەبێ جیاوازی لە بەینیان، وەکو فەرمایشتی لە یەکەمین ئایەت لە سورەتی (النساء) کە ئەفەرموێت: ﴿يَا أَيُّهَا النَّاسُ اتَّقُواْ رَبَّكُمُ الَّذِي خَلَقَكُم مِّن نَّفْسٍ وَاحِدَةٍ وَخَلَقَ مِنْهَا زَوْجَهَا﴾، واتە: ئەی خەڵکینە خۆتان لە نارەزامەندی‌و غەزەبی خودا بپارێزن بە دواکەوتنی فەرمان‌و قانون‌و ڕێکێشانی کە

ئێوەی لە نەبونەوە بە نێرو بە مێ لە یەك شتو یەك گیان هێناوەتە دی.

لە ئایەتی (٢١) لە سورەتی (الروم) ئەفەرموێت: ﴿وَمِنْ آيَاتِهِ أَنْ خَلَقَ لَكُم مِّنْ أَنفُسِكُمْ أَزْوَاجًا لِّتَسْكُنُوا إِلَيْهَا وَجَعَلَ بَيْنَكُم مَّوَدَّةً وَرَحْمَةً إِنَّ فِي ذَلِكَ لَآيَاتٍ لِّقَوْمٍ يَتَفَكَّرُونَ﴾، واتە: شایەدێك لەسەر بونو توانای بێئەندازەی خودا ئەوەیە كە لە جنسی خۆتان هاوسەرو ئافرەتی بۆتان هێناوەتەدی تا پاڵیان پێوەبدەن، خۆشەویستی و ڕەحمی خستۆتە بەینتان، ئەمەكە شایەدێكی دیكەی بونی خودایە لای ئەوانەی بیر ئەكەنەوەو بە باشی تێئەفكرن.

لە ئایەتی (١٩٥) لە سورەتی (آل عمران) ئەفەرموێت: ﴿فَاسْتَجَابَ لَهُمْ رَبُّهُمْ أَنِّي لاَ أُضِيعُ عَمَلَ عَامِلٍ مِّنكُم مِّن ذَكَرٍ أَوْ أُنثَى بَعْضُكُم مِّن بَعْضٍ...﴾، واتە: خودا بڕیاری داوەو فەرمویەتی من كردەوەو چاكەی كەس بزرناكەم چ نێربێت یان مێ، بەبێ جیاوازی لەبەینیان، هەر یەكە لە دواڕۆژا كردەوەی خۆی بە باشی دەسگیر ئەبێت.

خودا لە قورئانی پیرۆزا لە گەلێك جێ ناوی ئافرەت لەگەڵ ناوی پیاو پێكەوە دێنێتو كردەوەیان پێكەوە ئەخاتە بەرچاوو جەزایان چی بێت وەكویەك بڕیاری لەسەر ئەدات.

تەماشا كە لە ئایەتی (٣٥) لە سورەتی (الأحزاب) ئەفەرموێت: ﴿إِنَّ الْمُسْلِمِينَ وَالْمُسْلِمَاتِ وَالْمُؤْمِنِينَ وَالْمُؤْمِنَاتِ وَالْقَانِتِينَ وَالْقَانِتَاتِ وَالصَّادِقِينَ وَالصَّادِقَاتِ وَالصَّابِرِينَ وَالصَّابِرَاتِ وَالْخَاشِعِينَ وَالْخَاشِعَاتِ وَالْمُتَصَدِّقِينَ وَالْمُتَصَدِّقَاتِ وَالصَّائِمِينَ وَالصَّائِمَاتِ وَالْحَافِظِينَ فُرُوجَهُمْ وَالْحَافِظَاتِ وَالذَّاكِرِينَ اللهَ كَثِيرًا وَالذَّاكِرَاتِ أَعَدَّ اللهُ لَهُم مَّغْفِرَةً وَأَجْرًا عَظِيمًا﴾، واتە: بە ڕاستی ئەو مرۆڤانەو ئەو ئافرەتانەی كە مسوڵمانن‌و خاوەن بڕواو خاوەن ئیمانن‌و بە باشی بۆ خودا لاوانو بە باشی ئەیپەرستنو لە

وتاریانا ڕاستگۆن‌و لە کاتی ناخۆشیا خۆیان ئەگرن‌و هەراسان نابن‌و بەرامبەر خودا ملکەچن‌و خێرخواهن‌و دەست بۆ هەژاران درێژ ئەکەن‌و بەڕۆژو ئەبن‌و خۆیان لە دامێن پیسی لائەدەن‌و بەزۆری ناوی خودا دێنن، ئەوانە هەمویان خودا ڕەزامەندیو پاداشتی گەورەی بۆیان ئامادەکردوە.

تەماشای ئایەتەکە بکەو سەرنج بدە، بزانە خودا چۆن ناوی ئافرەت لە تەك ناوی پیاو جووت ئەکات‌و دوبارەی ئەکاتەوەو بۆ هەردوولا یەك ڕەزامەندیو یەك پاداشتی بۆیانی بڕیارداوە بێ جیاوازی لە بەینیان.

پێغەمبەر ﷺ فەرمویەتی: (خیرکم خیرکم لأهله وأنا خیرکم لأهلي)، واتە: باشترینتان باشترین کەستانە بۆ هاوسەرەکەی، منیش باشترینتانم بۆ هاوسەرەکانم. لە فەرمایشتێکی دیکەیا فەرمویەتی: ئەوەی بێ‌نرخ‌و دڵ کینەدار نەبێت بەسووکی تەماشای ئافرەت ناکات، لە فەرمایشتێکی دیکەیا فەرمویەتی: بەهەشت لەژێر پێی دایکان ڕازاندراوەتەوە.

لە ساڵی دەیەمی کۆچی پێغەمبەر ﷺ، لەگەڵ بەشێك لە یارەکانی کە چوو بۆ حەج کە پێی ئەوترێت (حجة الوداع) واتە حەجی دوعاخوازی، لە دامێن کێوی عەرەفە بە فەرمان‌و تارێك روی کردە یارەکانی، لە لایێکی وتارەکەیا فەرموی: خۆتان لە ناڕەزامەندی خودا بپارێزن، بە باشیو بە چاکی ڕووکردنە ئافرەتەکانتان، ئەوانە ئەمانەتی خودان لە لای ئێوە، ئەبێت بەو پێیە تەماشایان بکەن، هەروەکو ئێوە هەقتان بەسەر ئەوانا هەیە، ئەوانیش هەقیان بەسەر ئێوەدا هەیە.

خودای بەرزی بێوێنە – هەروەکو وتمان – پیاوو ئافرەتی لە یەکیان هێناوەتەدی، واتە: ئەو گیانەی یەکەم مرۆڤی لێهێناوەتەدی هەر لەوگیانە ئافرەتیشی هێناوەتەدیو دروستی کردوە، واتە پیاو ئافرەت لە ئادەمیزادیا، وەکو یەکن بەبێ هیچ جیاوازی لە نێوانیان.

بەڵان ئەگەر تەماشای دارشتنی بناغەی جەستەی ئافرەت‌و پیاو

بکەین ئەبینین جیاوازی لە بەینا هەیە، جیاوازیان لە ڕەنگو ڕوو لە دەنگی قسەو وتارو لە دارشتنی بەدەنیان هەیە.

ئەم جیاوازیە لە بەدەنیان خودا لە ئافرەتا وای هێناوەتە دی کە دوای یەکگرتنی لەگەڵ پیاو ئافرەت ببێتە گەورەترینو عەجایەب ترین کارگە لەم گێتیەدا بۆ بەرهەمهێنانی گیانی خاوەن بیرو هۆشو تێفکرینو زوبانو قسەووتارو نوسینونوسینکاری تا ئادەمیزاد لە ژیانیا بەردەوام بێت تا کۆتایی بەم گێتیەیا دێت.

ئافرەت وەکو پیاو لە گەڵێك ڕووەوە ئەو کارانە، کە پێویستە پیاو لە ژیانا بیهێنێتە دی پێویستی هێنانەدیەکەی ئاڕاستەی ئافرەتیش کراوە. هەروەها ئەوەی بۆ ئەو بڕیار دراوە، بڕیار دراوەکە ئەمیش ئەگرێتەوە، ئەمە کە بە عەرەبی بەم شێوەیە (لها ماله، وعليها ما عليه) هۆندراوەتەوە، واتە: ئەوەی بۆ ئەو هەیە بۆ ئەمیش هەیەو وە ئەوەی لەسەر ئەو پێویستە لەسەر ئەویش پێویستە.

ئەگەر ئێمە تەماشای توانای مرۆڤ بکەینو بەراوردی بکەین لەگەڵ توانای ئافرەت، ئەبینین خودا ئافرەتی توانادار کردوە بەسەر هەندێك کارا کە پیاوی تیا توانادار نیەو بۆی نالوێت، بەرامبەر ئەمە پیاوی توانادار کردوە بۆ ڕوکردنە هەندێك کار کە ئافرەتی تیا توانادار نەکردوە بۆ ئەوەی هەر یەکە لە پیاو و ئافرەت لە ژیانیا دەوری خۆی بە باشی بێنێتەدی بۆ دامەزراندنی کۆمەڵایەتی بەو شێوەیەی کە پێویستەو هەر یەکە بەو توانایەی کەوا هەیەتی بەشدار بێت لە دامەزراندنی شارستانیەتو پێش کەوتنی.

ئنجا دوای ئەم پێشەکیەی کەوا خستمانە بەرچاو با لەوەی کەوا دێت ڕوو بکەینە ڕەخنەی لە ئایین وەرگەڕاوەکان تا یەك بە یەك پۆخەڵیو بێنرخیو بێسەنگیەکانی دەربخەین.

# شـــایەدی ئافرەت لە کڕین و فرۆشـــتن و قەرزا

خودای بەرزی بێوێنــە لـە ئایـەتی (٢٨٢) لـە سـورەتی (البقـرة) دەربارەی قەرزو دەرخستنی ئەفەرموێت: ﴿...وَاسْتَشْهِدُواْ شَهِيدَيْنِ مِن رِّجَالِكُمْ فَإِن لَّمْ يَكُونَا رَجُلَيْنِ فَرَجُلٌ وَامْرَأَتَانِ مِمَّن تَرْضَوْنَ مِنَ الشُّهَدَاء أَن تَضِلَّ إْحْدَاهُمَا فَتُذَكِّرَ إِحْدَاهُمَا الأُخْرَى ...﴾، واتە: ئەگـەر قـەرزکردن و قەردپێدان لە بەینتانا ڕوویدا دوو پیاو بە شایەد لەسەر قەرزەکە بگرن، ئەگەر پیاو نەبوو پیاوێك و دوو ئافرەت بێت تا ئەگـەر یـەکێکیان کـە شایەدی ئەدات شتێکی دەربارەی شـایەدییەکە لەبیـر کـرد ئەوەکـەی دیکە بە بیری بخاتەوە، وەکو ئەوەی قەرزەکە هەزارو سـەدو پـەنجا دینـار بێت ئەو لە شایەدییەکەیا بڵێت هەزارو سەد دینارە پەنجاکـەی لـە بـیر بچێت، ئنجا ئەوەکەی تریان پەنجاکەی بە بیر بخاتەوە بڵێـت نـا هـەزارو سەدو پەنجا دینارە.

یان قەرزەکە بـۆ مـاوەی شـەش مـانگ و پـازدە ڕۆژ بێـت ئـەو لـە شایەدییەکە بڵێت بۆ ماوەی پێنج مـانگ و پازدە ڕۆژە، ئەوەکـەی تریـان ماوەکەی بە بیربخاتەوە بڵێت نا پێنج مانگ نیە شەش مانگە.

واتا مـەبەست لە بونی ئەو دو ئافرەتە ئەوەنیە کە هەر یەکـەیان بـە تایبەتی شایەدی بدات. ئنجا ئەگەر ئـەوەی کـە شـایەدییەکە ئـەدات شایەدییەکەی بە تەواوەتی داو هیچی لـێ لەبیـر نەکرد ئەوەکەی تریان هیچ قسەیێکی بۆ نیەو بەبێ قسە ئەوەستێت.

مـەبەست لە وشەی (تضل) لەبیرکردنە نەك مـەبەست پێی لە هـەق لادانەو شاردنەوەی شتێك لە شایەدییەکەیە.

ئنجا با بزانین لە شایەدیدان لەسەر قەرزو هەر مامەڵەکردنێکی دیکە یا وەکو کڕینو فرۆشتن ئەگەر شایەد لەسەر گرتنی پێویست بو، بۆ چ خودا لە باتی شایەدی پیاوێك دوو ئافرەتی بڕیارداوە.

قەرزکردنو قەرزپێدانو هەر مامەلەیێکی دیکەی وەکو ئەم کە لە بەینی ئەو کەسەی قەرز ئەداتو ئەوکەسەی قەرز ئەکاتو ئەو مەرجانە کە لە بەینیان ڕووئەدات بە قسەو قسەکاری پێك دێت، شایەد چ پیاو بێت یان ئافرەت چۆنی قەردەکەیان بە بیستن بۆ دەرئەکەوێت، ئنجا هەر ڕووداوێك کە بە بیستن لای پیاو یان لای ئافرەت دەربکەوێت لەوانەیە پاشی ماوەیێك لەبیرچون ڕووبکاتە بەشێکی ئەو ڕووداوە.

هۆکاری لە بیرکردن زیاتر ڕوو ئەکاتە ئافرەت لەوەی ڕوو ئەکاتە پیاو چونکە خودا ئافرەتی وا هێناوەتەدی کە مانگی جارێك حەیزی پیا بێتو زگپڕبوون بە منالّ ڕووی تێبکات، دوای مندالّ بون شیر بە منداڵەکەی بداتو شەوان خەو لە خۆی حەرام بکات بۆ ئاگا لێبونیو پاك کردنەوەی، جگە لەمە ئەبێت کاتێکی تەواو لە ژیانیا ڕووی پێبکاتە سەرپەرشتی منداڵەکانی تری تا ئەگەنە تەمەنێکی چەند ساڵیو کاروباری ناومالّ هەلّ بسوڕێنێو بۆ ئیش کردن ڕوو بکاتە دەرەوە ئەگەر پێویستی بە ئیش کردن هەبێت.

ئەم سەرقالّیانە ئافرەت وا لێئەکات کە زۆر ماندو ببێتو بیری بە گەلێك لایە پەرتو بلاّو ببێت لەبیرچون لە پیاو زیاتر ڕووی تێبکات. ئنجا ئەگەر لەسەر کارێك ببێت بە شایەد لەوانەیە لەبەر زۆر سەرقالّی پاشی ماوەیەك چۆنیەتی لایەکی شایەدیەکەی لا بزر ببێتو لەبیری بکات، ئنجا بۆیە پێویستە بۆ ئیحتیات لەبیرخەرەوەیێکی لەگەلاّ بێت تا ئەگەر شتێکی لەبیرچوو ئەو بەبیری بخاتەوە.

ئەمە جگە لەوەی کە ئافرەت بە زۆری لەلایـەن مامەڵـەو مامەڵـە کردنی ناو بازاڕو کاسبی کردن ئاگای لە عورف‌و عادەتی ناو کاسبکاران کەمەو زانیاری تیا زۆر نیە. شایەدیش ئەوەیە تۆ لە هەر وڵاتێکا ئەگەر ڕوو بکەیتە جێگای بۆرسە چۆنها ئەبێت ئافرەتێکی تیا نابینیت.

ئنجا بەوەی خستمانە بەرچاو بۆمان دەرئەکـەوێت کـە دوو ئـافرەت بڕیاردان لە شایەدیا لە باتی پیاوێك وەنەبێت بەکەم دانانێـك بێـت بـۆ ئافرەت‌و بڕوای پێ نەکرێت بەڵکو مەبەست پێی یارمەتیدانیـەتی بـۆ ئەوەی شایەدیەکەی زەدەی تێ‌نەکەوێت‌و بە باشی جێی خۆی بگرێت.

دوای ئەوەی خستمانە بەرچاو با دەربارەی شایەدی ئافرەت ڕای چـەند کەسێك لە مامۆستایانی قانون دەربخەین تا بـزانین رای ئـایین گـەلێك رێك‌و پەسەند ترە.

محامی بەناوبانگی فەرەنسی (جیلەر) ئەڵێت: درۆزنی ئافرەت زۆرجار بێگوناهان ئەخاتە ریزی گوناهباران.

پڕۆفیسۆر لە عیلمی جینائی (فوئاد عبدالمجید) ئەڵێت: ئافرەت بـە زۆری ڕوو لە درۆ ئەکات، بێ‌توانـایی خـۆی بـە مـەکرو فێـڵ‌و بـە دەم پێکەنین بەهێز ئەکات.

پڕۆفیسۆر لە عیلمی جینائی (مەحمود حەسەن) ئەڵێت: ئافرەت بـە تایبەتی نەخۆشی نەفسی داریان زوو بە هەڵە ئەچن، لە گەلێك ڕووداوە بە شایەدی ئەوان گەلێك بێگوناه تووشی ستەم هاتوە.

پڕۆفیسۆر لە عیلمی جینائی دکتۆر (احمد کامل) ئـەڵێت: ئـافرەت کە شایەدی ئەدات شایەدیەکەی بە پێـی خەیاڵانیـەتی یـان بـە پێـی کارێکە کە هەڵی ئەگرێتە سەر ئەوەی شایەدی لەسەر ئەدات، یان بـە پێی ئەوەیە کە لەلایەن یەکێکەوە کە پێی ئەڵێت چۆن شایەدی بـدات،

لەبەر ئەمە زۆرجار نابێت شایەدی منداڵو ئافرەت بسەلمێندرێت، هەروەها پرۆفیسۆر (فیری) ئەڵێت: دوای لێکۆڵینەوەی ئەو باسانەی مامۆستایانی مەدرەسەی تازەی ئیتالی دایانناوە دە خاڵی ڕوون کردۆتەوە یەکێك لەو خاڵانە ئەوەیە کە شایەدی منداڵو شایەدی پیاوی زۆر پیرو شایەدی ئافرەت گەلێك کات دورە لە ڕاستی حاکم ئەبێت خۆی لێ بپارێزێ و بڕوای پێنەکات[1].

ئنجا یا ئەو رایانە لەگەڵ ڕای ئایینو مامۆستایانی پێشووی ئایین بەراورد بکەین ئەبینین ئایینو مامۆستایانی ئایین وەکو ئەوان نەیانوتوە ئافرەت بە زۆری ڕووی لە درۆیەو ئەبێت گومانمان لە شایەدییەکەی هەبێت، بەڵکو وتویانە لە شایەدی دانیان لە مامەڵەیێك لەوانە شتێکی تیا لەبیر بچێت.

ئیبن حەزمی ئەندەلوسی کە زانایێکی بەرزی گەورەیەو خاوەنی کتێبی (المحلي)یە کە نزیکەی دە بەرگی گەورەیە، ئەڵێت جیاوازی نیە لە بەینی پیاوو ئافرەتا لە ڕووکردنە درۆ، واتا هەروەکو درۆ لە پیاو ڕوئەدات هەر بەو شێوەیە لە ئافرەتیش ڕوئەدات[2].

ئیبن القەییم کە زانایێکی بەرزەو خاوەنی چەند کتێبێکی زۆر بە نرخە ئەڵێت: ئافرەتی دادپەروەر ڕاستگۆییا وەکو مرۆڤ وایە جیاوازی لە بەینیان نیە[3].

---

1) بۆ گەڕانەوەی سەر ئەو قانونیانە تەماشای ئەم کتێبانە بکە: (١) السر في خطأ القضاء، ١٥٦، (٢) التحقيق الجنائي (القسم العملي)، ٢٣٨،٢٣٩ (٣) التحقيق الجنائي العملي والفني، ١٧٧ (٤) علم النفس القضائي، ٢٣، ٢٤، ١٢٨،١٣٠.

2) المحلي، ج ٩/٤٩٢

3) الطرق الحكيمة، ١٦١.

## شایەدی ئافـرەت لەسـەر جەریمەی کوشـتن

بەڵێ مامۆستایانی ئایین لە حەنەفیەکانو مالکیەکانو شـافعیەکانو حەنبەلیەکانو زەیدیـەکانو شـیعەکان لایانوایـە لـە جەریـمەی کوشـتنا شایەدی ئافرەت وەرناگیرێ، بەڵام هەند لـە مامۆسـتایانی دیکـەی زانـای پێشو وەکو ئەوزاعیو زوهریو حەمادو طـاوس عطـاء و سـوفیانو ئیبنـو حەزمی ئەندەلوسی لایان وایە شایەدی ئافرەت وەر ئەگیرێت بەمەرجێك دو کەس بن لەگەڵ پیاوێك هەروەکو لەمەوپێش لە شـایەدی لەسـەر قـەردو کڕینو فرۆشتن کەوتە بەرچاومان.

من لە کاتی خۆی – لـە سـاڵی ١٩٦٥ – کـە خـەریکی نوسـینی کتێبی (جناية القتل العمد في الشريعة الاسلامية والقانون الوضـعي) بوم بۆ شەهادەی ماجستێر لە زانکۆی بەغدا نەختێك بـەوردی سـەرنجم لەم باسەدا تا بزانم قسەی ئەو مامۆستا بەرزانە کـە وتویانـە شـایەدی ئافرەت لە جەریمەی کوشـتن وەرناگیرێـت ئایـە هـیچ بەڵگـەیێکی لـە فەرمایشتی خودا، یان لە فەرمایشتی پێغەمبەر ﷺ هەیە؟ تەماشـام کرد ئەوەی کە ئەوان بە بەڵگەی دائەنێن نابێتە بەڵگەی ڕاسنو نابێتە شایەد لەسەر ئەو ڕایەیان.

من نامەوێت ئـەوەی کـەوا لـەو کتێبـەم نوسـیومە دەربـارەی ئـەو بەڵگانەو ڕەدکردنەوەیان لێرە یەك بەیەك بیخەمە بەرچاو، چونکە ئـەوە درێژە پێدانی ئەوێت، ئێرە ئەوە هەڵناگرێت. من ئـەم باسـەم کـە لـەو کتێبەما نوسیومە کەمێك زیاتر لێی دواومو کردومە بە باسـێك لـە باسەکانی کتێبێکم کە ئەم ناوەی بە سـەرەوەیە (دراسـات في العقيـدة

والتفسیر والفقه) ئەم ساڵ (٢٠٠٧) لە چاپدراوەو ئێستاکە کە لە هەندێك کتێبخانەکاندا هەیە، ئەوەی ئەیەوێت بە درێژی ئاگای بە سەرباساکەیا هەبێت با لەو کتێبە تەمەشا بکات.

بەڵام ئەوەی ئەمەوێت لێرە بیڵێم ئەوەیە: کە لەکاتی خۆی کە لە باسەکە ورد بومەوەو بیرم لێکردەوە وام بۆ دەرکەوتو وای بۆچوم کە ئەگەر بۆ شایەدی لەسەر قەردو کڕینو فرۆشتن پێویستی بە دوو پیاو یان پیاوێكو دوو ئافرەت هەبێت، جەریمەی کوشتن هەروەکو بە شایەدی دوو پیاو دەرئەکەوێت بە شایەدی دوو ئافرەتی تەنیاش دەرئەکەوێت بەبێ ئەوەی پیاوێکیان لەگەڵا بێت.

دەربارەی ڕای بەشی یەکەمی مامۆستایان وتمان نە لە فەرمایشتی خوداو نە لە فەرمایشتی پێغەمبەر ﷺ بەڵگەیێکی لەسەر نیە، ڕاش بەبێ بەڵگە لەسەربون هەروا بە ئاسانی وەرناگیرێت.

ڕای بەشی دوەمی مامۆستایان دامەزراوە لەسەر قیاس، قیاس لەسەر شایەدی پیاوێكو دوو ئافرەت کە قەردو کڕینو فرۆشتنی پێی ئیسپات ئەبێت، بەڵام ئەگەر باش تەماشا بکەین ئەبینین ئەم قیاسە قیاسێکی لەنگەو تەواو نیە، چونکە هەروەکو کەمێك لەمەوپێش وتمان شایەد چۆنیەتی مامەڵەی قەردو کڕینو فرۆشتنی بە بیستنو قسە بۆ دەرئەکەوێت، شایەدیش ئەوەی ئەیبیستێت لەوانەیە پاشی ماوەیێك هەموی یا لایێکی لە چۆنیەکەی لەبیر بکات، ئنجا هەروەکو وتمان ئافرەت لەبەر زۆر سەرقاڵیو زۆر ئەركو زۆر ماندوبونی لەوانەیە لایێك لە چۆنیو چۆنیەتی مامەڵەکە لەبیر بکات، بۆیی بۆ ئیحتیات دوو ئافرەت لە باتی مرۆڤێك پێویست بوو.

بەڵام لە جەریمەی کوشتنا دەرکەوتنی بە بیستن نیە بەڵکو بە دیتنی چاوە، ئەوەی بە چاو ئەدیترێت لە کۆمپیوتەری مێشکا نەقش ئەکرێت و زۆر زەحمەتە لەبیرکردن ڕوی تێبکات، خاوەنەکەی چ پیاو بێت یان ئافرەت.

ئەمە کارێکی دیارو ئاشکرایە، هەموکەسێك هەست ئەکات ئەوەی کە بیستویەتی پاشی ماوەیێك هەموی نایێتەوە بیری، ئەبینێت هەموی یان بەشێکی لەبیرکردوە، بەڵام ئەو کارەی کە چەند ساڵێك بەسەر دیتنەکەی ڕابردوە چۆنییەکەی لەبەر چاویەتی‌و هیچی لێ بزر نەبوە.

ئنجا کوشتن کە کارێکە بە چاو ئەدیترێت چۆنیەکەی لە مێشکا جێگیر ئەبێت‌و نەقش ئەکرێت زۆر زەحمەتە بسڕدرێتەوە، مێشك چ مێشکی پیاو بێت یان مێشکی ئافرەت.

ئنجا ئەگەر دوو ئافرەتی هۆشداری ڕاستگۆی لە خواترس لەبەر چاویان کوشتنێك ڕویداو شایەدیان لەسەردا شایەدییەکەیان وەکو شایەدی دوو پیاو دێتەدی بەبێ ئەوەی مەزەندە هەبێت کە لەبیرکردنێك ڕوی لە لایێکی کارەکە کردبێت، لەبەر ئەمە شایەدییەکەیان وەرئەگیرێت‌و جەریمەی کوشتنەکە ئیسپات ئەبێت.

ئبنو لقەییم لە لاپەڕەی (١٥٠، ١٥١) لە کتێبەکەی (الطرق الحکمیة) ئەڵێت: ئیبنو تەیمییە وتویەتی: ئەو کارانەی بۆ دەرکەوتنی پێویستی بە شایەدی دو ئافرەت هەیە لەباتی پیاوێك ئەو کارانەیە کە عادەتەن لەبیرکردن ڕوی تێئەکات، بەڵام ئەگەر کارەکە لەوانە نەبو کە لەبیرکردن ڕووی تێبکات، وەکو ئەوەی بە چاو ئەدیترێت، یا لەوانە بە دەستی لێبدرێت شایەدی دوو ئافرەتی لەباتی پیاوێك پێویست نیە، واتە شایەدییەکە بە پیاوێك‌و ئافرەتێك دێتەدی.

ئنجا ئایە ئەو مامۆستا گەورانەی پێشو – ڕەحمەتی خودایان لە سەر بێت – بۆ چ لایان وابوە کە شایەدی ئافرەت لە جەریمەی کوشتن وەرناگیرێت مادام فەرمایشتێکی پێغەمبەری لەسەر نیە تا ببێتە بەڵگە لەسەر ئەو رایەیان.

ئەتوانین بڵێین ئەو ڕایەیان لە کاتی خۆی دامەزراوە لەسەر ئەو زوروفەی کە تیا ژیاون‌و ئەو عورف‌و عادەتەی کە لەو کاتەیا بوە.

ئافرەتان لەو کاتانەدا – بە پێچەوانە ئێستاکە تێکەڵاویان لەگەڵ گردبونەوەی پیاوان نە ئەبو، ئیش‌و کاری دەرەوەیان کەم بوو، هەموو ئیش‌و کارێکیان لە ماڵەکانیان ئەهێنایە دی، ئەگەر یەکێکیان بۆ هێنانە دی کارێك ڕوی بکردایەتە دەرەوە ڕووی لە کارەکەی ئەکردو بە پەلە بۆ ماڵەکەی ئەگەڕایەوە بەبێ ئەوەی نزیکی کێشەو بەرەیێك ببێت کە لە بەینی دو کەس ڕووی ئەدا، یان ڕابوەستێت تا بزانێت داهاتوی دووکەس کە بەرەنگاری یەکتربوون‌و یەخەی یەکتریان گرتوە بەچی ئەگات، یان بتوانێت بوەستێت ئەو ناخۆشیە ببینێت کە خوێنی تیا ئەڕژا.

ئەگەر رێك بکەوتایە بیدیتایە ئەوا یەکێك دەستی کوشتن بۆ یەکێك درێژ ئەکات ترس‌و لەرزین ڕووی تێئەکردو بە تاڵۆکە خۆی لەو جێیە دور ئەخستەوە چونکە توانای دیتنی خوێن ڕشتنی نەبو.

ئەگەر شایەد لەبەرچاوی، خوێن ڕشتنێك ڕووی بدایە سەری لێ ئەشێواو ترس داینەگرتو بینینی ڕووداوەکەی بە شێوەیێك نە ئەدی کە بتوانێت لەسەر چۆنیەتی ڕوداوەکە ببێتە شایەد، ئایا ئەو کەسەی کوشتنەکەی لێڕودا بەو کوشتنە خۆی پاراست لەوەی کوژراو کە دەستی کوشتنی بۆ درێژ بکات‌و بیکوژێت یان نا؟ ئیتر چۆن ئەتوانی

شایەدییەکەی بە باشی بدات‌و چۆن ئـەکرا شـایەدی لـێ وەبگیرێـت‌و لەسەر جەریمەی کوشتن ببێت بە شایەد.

کەوا بێت ڕای بەشی یەکـەمی ئـەو مامۆسـتایە بەرزانـەی پێـشو ڕاێیکی ڕاست تەواو بوە دامەزراوەو بڕیاری لەسەر دراوە بـە پێـی ئـەو زروف‌و کاتانەی کە تیای بوون.

بە پێچەوانەی زروف‌و کاتی ئەم چەرخە کە ئافرەت چاوی کراوەتەوەو لەناو کۆمەڵا ڕوو لە هەموو شوێنێك ئـەکات ئـەوەی تیـا ڕووئـەدات‌و ئەیبینێت ئەیەوێت بزانێت چی‌یەو بـۆ وا ڕویـدا، ئنجـا ئەگـەر دیتـی یەکێك یەکێکی کوشت ئەگەربو بە شایەد شایەدی دییەکەی بەو پێیەی ڕویداوە دێتەدی ئەگەر لەخواترس‌و ڕاستگۆو خاوەنی هۆش بو بێت.

# میـراتی ئافــرەت

عەرەبەکان پێش ئەوەی ئایینی ئیسلام بێت ئافرەتیـان بـە میراتگـیر دانەئەناو لە میراتیان بێبەش ئەکرد هەروەکو منداڵیان تێـدا بێبـەش ئەکرد، میرات تەرخان کرابـو بـۆ ئەوانـەی چـەکیان هەڵئـەگرتو لـە شەڕکردنا بەشدار ئەبون.

لە کاتی پێغەمبەر ﷺ لە شـەڕی ئوحـودا سـەعدی کـوڕی رەبیـع شەهید کرا، براکەی هات دەستی خستە سەر هەمو ماڵەکەی، خێزانـی سەعد لەگەڵ ئەو دوو کچەی کەوا هەیبو چـووە لای پێغەمبــەر، وتـی ئەزانی سەعد لەگەڵتان بەشدار بو لە شەڕاو شـەهید کـرا، برایەکـەی هات دەستی خستە هەمو ماڵەکەی ئێمەی تیا بێبەش کرد.

پێغەمبەر ﷺ تا ئەوکاتە دەربارەی میرات لە لایەن خـوداوە هیـچی بۆ نەهاتبوە خوارەوە، بەڵام دوای شکایەتی ئەم ئافرەتـە خـودا ئایـەتی (١١، ١٢) لە سورەتی (النساء) دەربـارەی مـیرات نـاردە خـوارەوە کـە بەشی زۆر بەی میراتگیری تیانا دەرخست، ئنجا پێغەمبـەر ﷺ بـانگی برای سەعدی کرد پێی فەرموو ماڵی سەعد هی تـۆ نیـە، دوو بەشـی ماڵەکەی هی دوو کـچەکەیەتی، هەشـت یەکەکـەی هـی ژنەکەیـەتی ئەوەی لەوان ئەمێنێتەوە هی تۆیە.

خودا لە ئایەتی یازدەی سورەتەکە ئەفـەرموێت: ﴿يُوصِيكُمُ اللهُ فِي أَوْلَادِكُمْ لِلذَّكَرِ مِثْلُ حَظِّ الأُنثَيَيْنِ﴾، واتـە: خـودا بڕیـاری خـۆی پێتـان ئەگەیەنێتو فەرمانتان ئەداتێ کە لە میراتـی منـاڵی نێرینـەتان دوو بەشی مێینەیان هەیە.

لە ئایین وەرگەڕاوەکان لێرەشا جووتی خۆیان ئەوەشێنن‌و ڕەخنە ئەگرن‌و ئەڵێن ئایینی ئیسلام بە چاوێکی نزم تەماشای ئافرەت ئەکات‌و جیاوازی ئەخاتە بەینی نێرینەو مێینە، نابینی مێینە بەشی لە میراتا نیوەی بەشی نێرینەیە، ئەمە کارێکە لەگەڵ عەدالەتدا ناگونجێ‌و ڕاست نیە، لەبەر ئەمە ئەبێت لە دانانی قانونا ئەم جیاوازیە لە میراتا هەبێت، بەشی پیاو و ئافرەت وەکو یەك وابێت.

ئێمە پێش ئەوەی لە هۆکاری ئەم جیاوازیە بدوێین‌و ئەوەی ڕاست‌و تەواوە دەری بخەین، ئەبێت بزانین لە هەمو دابەشکردنێکی میراتا پیاو دوو بەشی ئافرەتی بۆ نیە بەڵکو بەشی وەکو بەشی ئافرەتە بەبێ جیاوازی لە بەینیان، ئەمە بەم چەند خاڵەی کەوا ئەیخەمە بەرچاو دەرئەکەوێت:

١- ئەگەر یەکێك بمرێت‌و لە دوای خۆی باوك‌و دایك‌و کوڕێك‌و ژنێکی لەدوا بمێنێت، لێرە هەر یەکە لە باوکەکەو لە دایکەکە شەش یەکی میرات وەرئەگرن، بە جیاوازی لە بەینیان ژنەکەشی هەشت یەك وەردەگرێت ئەوەی ئەمێنێتەوە بۆ کوڕەکە ئەبێت.

٢- ئەگەر یەکێك دوای خۆی باپیرێك‌و داپیرێك‌و کوڕی کوڕی لە دوای بمێنێت لێرە هەر یەکە لە باپیرو لە داپیر شەش یەکی ماڵەکەیان بۆ هەیە بەبێ جیاوازی لە بەینیان، ئەوەی لە مان ئەمێنێتەوە بۆ کوڕی کوڕەکەی ئەبێت.

٣- ئەگەر ئافرەتێك دوای خۆی باوك‌و دایك‌و کچێك‌و مێردەکەی بە جێی هێشت، باوکەکەو دایکەکە هەر یەکە وەك یەك شەش یەك لە میراتەکەی وەرئەگرن بەبێ زیادی‌و کەمی لە بەینیان، کچەکە نیوەی

ماڵەکەی بۆ هەیە مێردەکەشی چوار یەکی، کـچە لێـرە بەشـی لـە هەموان زیاتر ئەبێت.

٤- ئافرەتێك ئەگەر بمرێتو وەرەسەکانی براێیکی دایکیو خوشـکێکی باوکیو خوشکێکی باوکیو دایکیو دایکی بو، لێرە بـرای دایکـیو خوشکی باوکی هەر یەکەو شەش یـەك وەرئـەگرن دایکـشی شـەش یەك وەرئەگرێتو خوشکی دایـكو بـاوکی نیـوەی ماڵەکـە ئەبێتـە بەشیان، لێرە براو خوشکی یەکەم هەر یەکـە بەشـیان وەکـو یەکـە بەبێ جیاوازی لە بەینیان، بەڵام خوشـکە بـاوكو دایکەکـە بەشـی هەمو ماڵەکە واتە بەقەد هەمو میراتگرەکانی دیکەیە.

٥- ئەگەر میراتگری یەکێك بریتی بو لە براێکی دایکیو خوشـکێکی دایکیو مێردەکەیو داپیری، لێرە براو خوشکە دایکەکە هەردوکیان سـێیەکی میراتەکەیان بەر ئەکەوێت لە بەینی خۆیان ئەیکەنە دوو بەش، هەر یەکە بەشێك وەرئەگرێ وەکـو یـەك بـەبێ جیـاوازی لـە بەینی نێرو مێییان، مێردە نیوەی میراتەکە وەرئەگرێتو داپیرەکەش شەش یەکی.

کەواتە بۆمان دەرکەوت کە لە هەمو میراتێکـا وە نـەبێت ئـافرەت نیوەی بەشی پیاوی هەبێت، زۆرجار وا ئەبێت بەشی هەردو لایان وەکـو یەك ئەبێت، هەندێك جاریش بەشی ئەم پتـر ئەبێت لە نێرینەی بـرای، وەکو ئەوەی میراتگیری سێ برای دایکیبن لەگـەڵ خوشـکێکی دایکـیو باوکی لەگـەڵ دایکیـان، لێـرە هـەر سـێ براکـە سـێیەکی میراتیـان بەرئەکەوێت، خوشـکەکە نیـوەیو دایکـە شـەش یـەك، واتـە ئەگـەر میراتەکە شەش هەزار دینار بێـت سـێ براکـە هەرسـێکیان دو هـەزار

دیناریان بەرئەكەوێت، خوشكەكە سێ هەزاری بەرئەكەوێت دایكەش بەشی هەزار دینار ئەبێت.

بەلام بەشی براو خوشكی باوكو دایكی ئەبێت بە فەرمانی ئایەتەكە بێت واتە لە میراتا كوڕ دو بەشی كچی بەرئەكەوێت. ئەمە هیچ كێشەو بەرەبێك هەلناگرێت، چونكە بڕیاردانی خودایە، ئەوەی مسولمانەو خاوەنی ئیمانە بەرامبەر فەرمانی خودا ئەبێت ملكەچ بێتو پێی قایل بێت، ئەبێت بزانێت ئەوەی خودا بڕیاری لەسەر ئەدات خالی نیە لە مەبەستو حیكمەت چ ئەو مەبەستو حیكمەتەمان بۆ دەربكەوێت یان نا.

بەلام ئێمە ئەگەر كەمێك لەم بڕیاردانەی خودا وردببینەوە ئەبینین پڕە لە حیكمەتو ڕێكو تەواوە لەگەل عەدالەت، ئەگەر یەكێك بمرێت لەگەل میراتگیریەكان كوڕێكو كچێكی لەدوا بمێنێ ئەبینین كوڕەكەی زۆر زیاتر لە كچەكەی پێویستی بە مالو خەرجیو دەرامەت هەیە، چونكە ئەگەر ڕەبەن بێت پێویستی بە ژن هێنان هەیە، ژن هێنانیش هەروەكو ئەزانین پێویستی بە مەسرەفێكی زۆر هەیە، وەكو مارەیی ئافرەتو خەرجی گواستنەوەو تفاقی ناومال ئامادەكردنو خانو كڕین یان بە كرێ گرتن، ئەمە هەموی وا ئەكات كە باری كوڕ زۆر قورس بێتو پێویستی بە مالو پارەو مالێكی زۆر هەبێت، وە ئەگەر نا ناتوانێت خێزاندارێك بۆ خۆی پێك بێنێت.

كوڕەكە ئەگەر شایەد ڕەبەن نەبوو خاوەنی خێزانو مالو مندال بوو لێرەشا كوڕ پێویستی بە مالو خەرجی زۆر ئەبێت بۆ ئەوەی بتوانێت گوزەران بۆ مالو مندالەكانی ڕۆژ بە ڕۆژ بڕەخسێنێو ئیدارەیان بە

شێوەیەکی گونجاو بێنێتە دی، بەڵام خوشکەکەی کە شو ئەکات پێویستی بە هیچ خەرجیەك نیە، وە هیچ مەسروفێك ڕوی تێناکات، کە شـو ئـەکات مارەیی وەرئەگرێت بە پێچەوانەی براکـەی کـە ژن دێنێـت ئـەبێت مـارەیی بدات، ئنجا کە ئەکەوێتە مـاڵی مێردەکـەی، ئـەو مێـردە ئـەبێت هـەموو پێویستیەکی ژیانی بۆ بڕەخسێنێت لە جـلو بـەرگو خـواردنو خواردنـەوەو هەمو مەسروفێکی تری، وەکو بردنە لای دکتۆرو کڕینی دەرمـانو خـەرجی سەفەر. کە مناڵیشی ئەبێت هەرچی پێویـست بێـت بـۆ بـەخێوکردنی لـە لایەن مەسروفەوە ئەکەوێتە سەر شانی مێردەکەی، هیچ خەرج کردنێـك ڕوو ناکاتە ئەو.

ئنجا ئەگەر بە باشی سەرنج بـدەین ئـەبینی ئـاینی ئیـسلام زۆرتـر لایەنگری ئافرەتی کردوە بەو بەشەی کە لە میرات بۆی بڕیار داوە.

شتێکی دیکەش جێی ئەوەیە ئاماژەی بۆ بکرێت کـە ئەبێتـە هـۆی ئەوەی لە میراتا بەشی کوڕ زیاتر بێت لە بەشی کچ. زۆرجار ئەدیترێت- بە تایبەتی لە لادێیەکانا – ئەو ماڵو سامانەی کـە بـاوك دوای خـۆی بەجێی دێڵێت پەیاکردنی یارمەتیدانی کوڕەکەی تێدا هەیە هەر جـۆرە یارمەتیەك بێت، چ زۆر بێت یان کەم، وەکو ئەوەی لەگەڵ باوکی ئیشی کردبێ یان بەراو ئەدبیر یارمـەتی دابێـت. ئەمـەش وا ئـەخوازێت کـە ئەبێت لە میراتا بەشی لە بەشی خوشکەکەی زیاتر بێت.

## تــەلاق بە دەســت کێیــە؟

لە ئایین وەرگەڕاوەکان رەخنەیەکی دیکەیان ئەوەیە ئەلێن: تەلاق دان بۆچی ئەبێت هەر بەدەست پیاو بێــت؟ بــۆ چ ئــافرەت بەشــداری تێــدا نەبێتو نەتوانێت خۆی لە بەندایەتی مێرد رزگار بکات؟

ئنجا با رووبکەینە ئەم باسەو نەختێکی لــێ بدوێین تــا بــزانین ئــەم رەخنەی ئەو لە ئایین وەرگەڕاوانە سەنگێکی هەیە یان وەکو رەخنەکانی دیکەیان بێبەلگەو پوچەڵە.

خودای بەرزی بێوێنە بەردەوامبونی ژیانی ئادەمیزادی لەم گێتیەدا بەنــد کردوە بە یەك گرتنی پیــاو و ئــافرەت، ئــەم یــەك گرتنــە ئــەبێت بــە پێــی رێکێشانی شەرع و ئاین بێت کە بە مارە کردن روو ئەدات و دێتە دی.

ئەم دەستی یەك گرتنە نابێت بۆ کاتێکی تایبەتی ئــەبێت بــەردەوام بێتو پچڕان روی تێنەکات بە مردنی یەکێکیان نــەبێت. ئــەم دەســتی یەکگرتنە خودای بەرزی بێوێنــە لــە ســورەتی (النســاء) لــە ئایــەتی بیستــەما بە ﴿میثاقاً غلیظاً﴾ ناوی ئەبات واتە بەند بون بە بەندبونێکی ئەستوری قایم کە نابێت هەر وا بە ئاسانی لێکردنەوە روی تێبکات.

بەلام لەگەل ئەوەی ئەم یەکگرتنە ئەبێت بەردەوام بێتو دابــڕان روی تێنەکات وا ئەبێت پیاوێكو ئافرەتێك دوای دەستی یــەك گرتنیــان بــە ماوەیەك، هەر یەکەیان نارەزایی لە کردەوەو رەوشــتی ئەوەکــەی تریــان دەرئەخاتو ساردیو ناخۆشی ئەکەوێتە بەینیان بەشێوەیەك کە لایەکی دەرگای جیابونەوەیان بۆ ئەکرێتەوە، ئەو جیابونەوەیــەش بــە تــەلاق دان دێتە دی، ئەو تەلاقدانەش دراوەتە دەست پیــاو نــەك دەســتی ئــافرەت،

پیاوو ئافرەت هەردولا خاوەنی بیرو هۆشن، هەروەها هەردولا خاوەنی عاتیفەن، بەڵام بیرو هۆش لای پیاو زاڵە بەسەر عاتیفەکەیا، بە پێچەوانەی ئافرەت کە عاتیفەکەی بەسەر بیرو هۆشیا زاڵە.

ئەمە شتێکی دیارو ئاشکرایە کێشەو بەرە هەڵناگرێت، ئەبینی ئافرەت لەبەر ڕوداوێکی نەختێك ناخۆش کە ڕوی تێئەکات خۆی ناگرێتو گریانو فرمێسك ڕژاندن داگیری ئەکاتو ڕۆژی لێ تاریك ئەبێت بە پێچەوانەی پیاو کە بەرامبەر هەر ڕوداوێکی ناخۆش خۆی ئەگرێتو عاتیفەی لە مەندایەتی خۆی لای نادات.

بەهێزبونی عاتیفە لای ئافرەتو زاڵ بونی بەسەر بیرو هۆشیەوە نەبێت کەمێیك بێت بۆی، بەڵکو ئەمە ئەبێت لە ئافرەت وابێت، ئەگەر یەکێکیان وانەبێت ئەبێت زەدەیەك لە هەستو عاتیفەیو هۆشو بیریا هەبێت، چونکە خودا بناغەی لەشو هەستو دڵ نەرمی ئافرەتی وا دارشتوە کە ببێت بە دایكو منداڵەکانی بخاتە ژێر باڵی عاتیفەییو دڵسۆزیا، وە گەر نا نەیئەتوانی منداڵێك شیر بداتو بەخێوی بکات. نابینیت ئافرەتێك ئەگەر منداڵەکەی نەخۆش بکەوێت دونیای لەبەرچاو تاریك ئەبێت شەوان خەو لە خۆی حەرام ئەکاتو بە دیارییەوە دائەنیشێتو ناوەناوە فرمێسك لەسەر چاوی لائەبات، لەکاتێکا باوکی منداڵەکە لە خەوا ئەپرخێنێ.

ئنجا بەم شێوە نەفسیەی کە ئافرەت لەسەریەتی ئەگەر تەڵاق دانی بەدەست بێت ئەگەر ناخۆشیەکی کەم لەگەڵ مێردەکەی ڕووبدات هەڵچون داگیری ئەکاتو ڕوو لە تەڵاقدان ئەکات بەبێ ئەوەی بیرو هۆشی بەکار بێنێت کە تەڵاقدانەکەی چ ناخۆشیەكو تاڵیەکی

بەدواوە دێت، بەڵام کە سارد ئەبێتەوە پەشیمانی ڕوی تێ ئەکاتو بە هەردوو دەست لە چۆکی خۆی ئەدات کە چۆن ماڵی خۆی وێران کرد بەبێ ئەوەی پەشیمانیەکەی سوودێکی پێ ببەخشێ.

بەڵان پیاو کە تەڵاقی بەدەستە چونکە بیرو هۆشی بەسەر عاتفەکەیا سوارە چۆنها نەبێت لەسەر ناخۆشیەکی هاکەزایی لەگەڵ هاوسەرەکەیا زو هەڵەناکاتو ڕوو ناکاتە تەڵاقدان، چونکە بیرئەکاتەوە ئەگەر تەڵاق بدات منداڵەکانی پەراگەندە ئەبنو ئەبێت مارەیی دوایی هاوسەرەکەی بداتو نەفەقەی سێ مانگی بۆ بژمێرێت، دوایش هەروا بە ئاسانی ناتوانێت ژنێکی دیکە مارە بکات چونکە پێویستی بە پارەو خەرجیەکی زۆر هەیە.

ئەمە جگە لەوەی ئەگەر خاوەنی بیرو بڕواو ئیمان بێتو ترسی خودا ڕوی تێنەکات کە نابێت لەسەر ناخۆشیەکی کەم ئەو پەیمانە بەهێزەی کە بە ڕێکێشانی خودا لەگەڵ هاوسەرەکەی هاتۆتە دی هەروەها بە ئاسانی بیپچڕێتو ئەو ئافرەتە ماڵ وێران بکات جگە لەوەی کە ئەزانێت پێغەمبەر ﷺ فەرمویەتی: (أبغض الحلال الى الله الطلاق)، واتە: پێناخۆشترین شت لای خودا کە دروستە تەڵاق دانە.

بەڵێ، زۆربەی مامۆستایانی مەزهەبەکان لایان وایە کە تەڵاق دان بە دەست مێردە نەك بەدەست هاوسەرەکەی، بەڵام مامۆستایانی حەنەفی لایان وایە ئافرەت کە شوو ئەکات لە کاتی مارەکردنی مارەکردنەکەی بە مەرجێك بێت هەر کاتێك ویستی خۆی تەڵاق بدات، ئنجا ئەگەر ئەو کەسەی مارەکردنەکەی لەگەڵ ئەبەستێت بەم مەرجە قایل بو

مارەکردنەکە دێتەدیو ژنەکە هەر کاتێك ناخۆشییەکی لە مێردەکەی دیت ئەتوانێت خۆی تەڵاق بداتو لە مێردەکەی جیا ببێتەوە.

ئەمە جگە لەوەی کە ئافرەت ئەتوانێت لای قازی لە مێردەکەی داوای جیابونەوە بکات، لەبەر چەند شتێك کە ئێرە جێی درێژە پێدانی نیەو مەزهەبەکان درێژەیان پێداوە.

## مافـــی ئافرەتـــان

ئایا ئـایینی ئیـسلام مـافی ئـافرەتی نـەداوە هـەروەکو لـە ئـایین وەرگەڕاوەکان ئەڵێن، یـان وانیـەو ئـەم ئایینـە هـەموو مـافێکی بـۆ بڕیارداوە کە مافی تەواو و ڕاستەقینەیەتی.

لە باسی (تێڕوانینی ئیسلام دەربارەی ئافرەت) کە پێشتر هەنـدێکی لـێ دواین، وتمان ئایینی ئیسلام بە یەك چاو تەماشای پیاو و ئـافرەت ئەکات ئەوەی بۆ پیاوی بڕیار داوە بۆ ئەویشی بڕیار داوە، ئەوەی لەسەری بە پێویست داناوە هێنانە دیەکەی لەسەر ئەویش بە پێویستی دانراوە.

لەوێ چەند فەرمایشتێکی پێغەمبەرمان ﷺ لەسەر ئەوەی وتمان بە بەڵگە خستنە بەرچاو، هەروەهاش چەند ئایەتێکی قورئـانی پیرۆزیـش، لەو فەرمایشتانە بۆمان دەرکەوت کە ئایینی ئیسلام نێرو مێ پێکـەوە ناو ئەبات و بەیـەك تەمەشـاکردن تەماشـایان ئـەکات، هـەروەکو لـە ئایـەتی (٩٧)تـیش لـە سـورەتی (النحـل) بۆمـان دەرئەکـەوێت کـە ئەفەرموێت: ﴿مَنْ عَمِلَ صَالِحًا مِّن ذَكَرٍ أَوْ أُنثَى وَهُوَ مُؤْمِنٌ فَلَنُحْيِيَنَّهُ حَيَاةً طَيِّبَةً وَلَنَجْزِيَنَّهُمْ أَجْرَهُم بِأَحْسَنِ مَا كَانُواْ يَعْمَلُونَ﴾، واتـە: ئـەوەی رووی کردبێتە هێنانەدی کاری چاکەو خاوەنی بـڕواو ئیمـان بێـت چ نێرینـە بێت، یان مێیینە لە دوارۆژا وەکـو یـەك بـەژیانێکی خـۆش و ئاسـوودە زینـدووی ئەکەینـەوەو گـەلێك باشـتر لـەوەی لـە ژیانیـا کردویـەتی و هێناویەتە دی.

ئەم ئایەتەش شایەدێکی دیکەیە کە خودا جیاوازی نەخستۆتە بەینی پیاوو ئافرەت، ئینجا هەر بەو پێیە لەم ژیانەیا ئەو مافەی بۆ ئەوی بڕیار داوە بۆ ئەمیشی قەرار داوە کە مافی تەواوو ڕاستیەتی. ئەم مافانەی کە ئافرەتان لە ئەوروپا تا دوانزە چەرخ زیاتر دوای هاتنی ئایینی ئیسلام دەستی نەکەوتبو، ئنجا با هەندێك لەم مافانە بخەینە بەرچاو:

١- لە باسێکی کە لەمە پێشتر باسم کرد کە جەنابی (عومەری کوری خەتتاب) ڕۆژێك هاوسەرەکەی لەسەر کارێك لەگەڵی ئەکەوێتە کێشەو بەرە، جەنابی عومەر پێی ئەڵێت: ئەی ئافرەت ئێوە پێش ئەوەی ئایینی ئیسلام بێت هیچ نرخێکتان نەبوو، ئەم ئایینە کەهات ئێوەی لەگەڵ پیاوان یەکسان کردوو نرخی تەواوی پێدا، ئەمە ئەبێت وات لێ بکات بەرامبەرم بوەستیتو بەم شێوەیە لەگەڵم بدوێیت؟ ئافرەت وتی بۆچ نا، کچەکەت (حەفصە) کە خێزانی پێغەمبەرە هەندێك جار بەرامبەری ئەوەستێتو لەگەڵی ئەکەوێتە مشتومڕ بە شێوەیێك پێغەمبەر ﷺ بە درێژایی ڕۆژەکە دڵ شکست ئەبێت.

٢- ئاینی ئیسلام خوێندنو خوێندەواری لەسەر پیاوو ئافرەت بە پێویست داناوە، ئافرەت بۆی هەیەو زۆر پەسندە تا ئەتوانێت پلەی خوێندنو زانستی خۆی بەرز بکاتەوە.

٣- ئافرەت وەکو پیاو ئەتوانێت خاوەنی ماڵو سامان بێتو بازرگانیو کاسپی تێدا بکات، بەبێ ئەوەی خزمێکی یان مێردەکەی هەقی ڕێ لێگرتنی هەبێت.

٤- ئەتوانێت بە پێــی ئــارەزووی خــۆی شــوو بــەو کەســە بکــات کــە ئەیەوێت، هیچ کەسێك لە خزمانی ئەگەر چی باوکیشی بێـت بـۆی نیە بە خورتی لــە یــەکێکی مــارە بکــات، ئینجــا ئەگــەر بیکــات مارەییەکە نابێتو دروست نیە.

ئــەوەی لــەناو کوردەواریــا لــەم ڕووەوە ڕووی تێئــەکرێ ئــایین ڕێــی پێنادات‌و دروست نیە، ئەگەر چی هەندێك لە مامۆســتایان فتــوای پێئەدەن.

من ئەمەم لە باسێکی کتێبەکەم کە ناوی (دراســات في العقيــدة والتفسير والفقة) بە درێژی ڕوون کردۆتەوەو ئەوەی لەوەو پێش لەسەر دوست بــوونی لەلایــەن مامۆســتایان بــە بەڵگــە دانــدراوە بەڵگــە نەبوونەکەیم دەر خستوە.

٥- ئافرەت کە شوو ئەکات ئەو مارەییەی بۆی بڕیــار ئــەدرێت هــەقی خۆیەتی هیچ کەسێك لــە خزمــانی حــەقی ئــەوەی نیــە دەســت بــۆ پولێکی درێژ بکات، خۆی چۆنی بوێت ئەوها خەرجی ئەکات.

٦- کە شوو ئەکات هیچ شێوە مەسرەفێك نە بۆخۆی نە بۆ منداڵەکانی ڕووی تێناکات هەر چەندێك تواناداڕو هەبوو بێت. ئەبێت مێــرد بــە هەموو مەسرەفێك‌و خەرجییەك هەڵبستێت، بەڵام ئەگەر ئافرەتەکــە بە ئارەزوی خۆی لە مەسرەفا یارمەتیدەر بێت ئــەوە چــاکەییکە بــە هەوەسی خۆی ڕووی تێئەکات.

٧- ئافرەت بەپێی ئــەو توانــاو خوێندەوارییــەو شــەهادەیەی دەســگیری ئــەکات هــەقی ئــەوەی هەیــە لــە دائیرەکــانی حکومــەت یــان لــە

شەریکەیەکا دابمەزرێت‌و ببێت بە مووچەخۆر، بە تایبەتی لە نەخۆشخانەکان‌و لە هەموو پلەیێکی قوتابخانەکانا.

٨- ئەتوانێت بە پێی ئەو خوێندەوارییەی هەیەتی خۆی هەڵبژێرێت بۆ ئەوەی ببێتە ئەندامێك لە ئەندامەکانی پەرلەمان‌و مافی ئەوەی هەیە لە هەموو کێشەو بەرەیەك کە تیا ڕوو ئەدات بەشدار بێت‌و ڕای خۆی دەربخات لەو سنوورەی کە ئایین دایناوە.

٩- مافی ئەوەی هەیە لەناو کۆمەڵگا ئەندامێك بێت لەو پارتانەی کە بەرنامەیان ئیسلامەو یاسای ئیسلام پەیڕەو دەکەن، تێدا خاوەنی ڕاو قسەو وتەو بیر بێت.

١٠- هەروەکو مافی ئەوەی هەیە لە پەرلەمانا ببێت بە ئەندامێك لە ئەندامەکانی ئاواش مافی ئەوەی هەیە بە پێی ئەو خوێندەوارییەو شەهادەیەی هەیەتی لە وەزارەتێکا ببێت بە وەزیر، هەر چەندێك ئەو مرۆڤانەی تیا موچەخۆرن هەموو پیاوبن، ئەوەی لە ئارادایە ئەبێت دانایی‌و تواناداری ڕاپەراندنی‌و هێنانەدی کاری ئەو جێگەیەی هەبێ، کە ئەو سەرۆکیەتی.

١١- ئیبن حەزمی ئەندەلوسی کە مامۆستایێکی زۆر بەرزەو خاوەنی چەند کتێبێکە کە گەورەتریان (المحلّى)یە کە نزیکەی دە بەرگی گەورەیە، ئەڵێت: ئایینی ئیسلام دەست بەسەرگرتنی هیچ کارێکی لە دەوڵەتا لە ئافرەت قەدەغە نەکردوە تەنیا پلەی سەرۆکایەتی وڵات نەبێت.

١٢- ئافرەت مافی ئەوەی هەیە لە دەرەوەی ماڵ ڕوو لەو کارانە بکات کە باسمان کرد، هەروەها کارانی دیکەش کە لە توانایا بێت بە دوو مەرج:

أ- ئیشی دەرەوەی نابێت کاری ناو ماڵی خۆی پێی لەبیر بکات، ناو ماڵ بەدەستی خاتوونی خاوەن ماڵ نەبێت ناڕازێندرێتەوەو نەشئەی خۆی وەرناگرێت، ئەو ئاگا لێبونەی کە پێویستە بۆ منالّی ساوا نابێت لێی دوا بکەوێت و هەموی بداتە دەست دایەن،چونکە باوەشی دایك نەبێت خۆشیو گەشایەتی بەگیانی مندالّ ناگەیەنێ.

ب- کە ڕو ئەکاتە دەرەوە بۆ هەر کارێکی بێت ئەبێت جلـــوبەرگی پۆشتەو داپۆشـــەر لەبەر بکاتو لە قســـەو وتاریا ئەبێت گرانو سەنگین بێت، نەك لەوانە بێت کە دێتە دەرەوە بارێك بۆن لەخۆیان ئەدەنو خۆیان ئەرازێنەوەو پێلّوی سەرچاویان بە ڕەنگی ئەو جلەی لەبەری ئەکەن لە سوورو مۆر سەوز ڕەنگ ئەکەنو سنگیان بەرەلاّ ئەکەنو جلّی تەسكو تروسك لەبەر ئەکەن، ئنجا کە دائەنیشن قاچ لەسەر قاچ دائەنێنو قاچیان تاسەر چۆکیان دەر ئەخەن.

ئەمە ماف نیە بۆ ئافرەت، ئەمە لە سنووری حـەیاو حورمەت لادانەو لە شورەی راســـت دەرچونەو مێیەتی خۆ دەرخســـتنەو بە غەریزەی جنســـی یاری کردنەو جولە پێی دانیەتیو رەوشتی رێك راست لەناو کۆمەلاّ تێك دانەو بەلای خراپە بردنیەتی.

١٣- ئنجا با باسەکەم بەم خالەی سێنزەما کۆتایی بێنینو بزانین ئایە ئافرەت مافی ئەوەی هەیە ببێتە سەرۆکی ولاّت، چ جەمهوری بێت یان مەلەکی، هەروەها ئایە ئاینی ئیسلام ئەم مافەی بۆ بڕیار ئەدات یان نا؟

ئێمە با بەشێوەیەکی دیکە تەماشای ئەم باسە بکەینو بیخەینە بەرچاو تا ئەم دروست بونە یان دروست نەبونەمان بۆ دەرئکەوێت، بەبێ ڕوکردنە ڕای زۆربەی مامۆستایانی کۆنو تازەی ئاین کە ئەڵێن: دروست

نیە، لەگەڵ ڕای ئەم مامۆستا دانایانەی زۆر کەمەی ئێستای ئاین کە ئەڵێن دروستە.

مەلیك ئێستاکە هەروەها سەرۆکی جمهوری لـە زۆربـەی ولاتـەکانی رۆژئاوا یان پیاوە یان ئافرەتە بەڵام هەڵسوراندنی کاروبـاری ولاتەکـەی هیچی بەدەست نیە هەروەکو ئەمە دیارو ئاشکرایە لە سویدو دانیمارك‌و نەرویج‌و بەریتانیا، هەروەها لە تورکیاو لە ئیسرائیل ولاتانی دیکەش.

سەرۆکایەتی بەپێی ئاینی ئیسلام نابێت وابێت چ ناوی مەلیك بێت یان خەلیفە یان سەرۆکی جمهوری. سەرۆك ئەبێت دەستێکی بالای هەبێت لە هەڵسوڕاندنی سیاسەتی ولاتەکەی چ پەیوەندی بە دەرەوەی ولات بێت یان بەناویەوە، ئەبێت بە شێوەیەکی تەواو خاوەنی راو قسەو تەکبیر بێت لە بەڕێوەبردنی کاروباری ولات‌و میللەت، ئەبێت دوای لێکۆڵینەوەو موشاوەرە خاوەنی قسەی خۆی بێت‌و لـێ لانەدات‌و کزی ڕوی تێنەکات بەرامبەر وەستان ئەو کارە گرنگانەی کە پێویستی بە ڕشت بون‌و توندی هەیەو دو دڵی هەڵناگرێت.

سەرۆك ئەبێت زۆربەی کاتی رۆژەکانی تەرخان بکات بۆ سەرپەرشتی کارو باری ولاتەکەی و دانیشتوەکانی‌و خاوەن و هەڵگری باری گەورە بێت.

مەبەستم ئەوە نیە کە لە ولاتەکەیا دیکتاتۆرو شێوە درەندەیك بێت، بە پێی ئارەزووی خۆی ولات بەڕێوەبەرێت، هەروەکو ئەمە پیشـــەی بەشێکی زۆری سەرۆکی ولاتەکانی عەرەبە، مەبەستم ئەوەیە کە ئەبێت ئاگاداری بەسەر هەمو کاروبارێکی ولاتەکەدا هەبێت، ئەگەر لە ڕووکر نە کارێك رایك لەلایەن کاربەدەســـتەکانی خوار خۆی ڕازی نەبو نابێت

بێدەنگ بێت، ئەبێت بەجوانی لەگەڵیان بکەوێتە بێنەو بەرە، تا یان ڕای خۆی پێیان ئەسەلمێنێ یان ئەوان ڕای خۆیانی پێی ئەسەلمێنن.

هەروەکو خەلیفەی دادپەروەر جەنابی عومەری کوڕی خەتتاب لەگەڵ چەند کەسێك لە یارەکانی پێغەمبەر ﷺ کە یەکێکیان بیلالی حەبەشی بو کەوتە بێنەو بەرە کە لە عێراقا بەشداربون لە جیهادکردن ئەیانویست خاکی عێراق بەسەریانا دابەش بکرێت، جەنابی عومەر بە دوربینی خۆی ڕای وابو کە دەبێت ئەو خاکە بەشی خەزێنەی دەوڵەت بێت، تا ئەو بەروبوومەی لێی ڕوو ئەدات بەپێی پێویست لە هەموو کاتێکدا بۆ هەموان بێت بە تایبەتی بۆ هەژاران، نەك تەرخان بێت بۆ بەشێكو دەوڵەمەندی تیانا لە زۆربون بێتو دەستکورتانی تێدا بێبەش بێت.

ئەو بێنەو بەرەیە لە بەینیان سێ چوار ڕۆژی خایاند، هەر لایە لەسەر ڕای خۆی ڕشت بو، تا جەنابی عومەر پێیانی وت بەڵگەم لەسەر ئەوەی ئەیلێم لە فەرمایشتی خودایە کە لە ئایەتی (٧) لە سورەتی (الحشر) ئەفەرموێت: ﴿مَّا أَفَاء اللهُ عَلَى رَسُولِهِ مِنْ أَهْلِ الْقُرَى فَلِلَّهِ وَلِلرَّسُولِ وَلِذِي الْقُرْبَى وَالْيَتَامَى وَالْمَسَاكِينِ وَابْنِ السَّبِيلِ كَيْ لَا يَكُونَ دُولَةً بَيْنَ الْأَغْنِيَاء مِنكُمْ﴾، واتە: ئەو ماڵەی کە خودا لە دانیشتوانی شارەکانو دێیەکان ژێردەستەی پێغەمبەر ئەکات، بۆ پێغەمبەرو بۆ خزمانی هەژارانیو بۆ هەتیوو بۆ هەژارانو بۆ ئەوانەیە کە لە سەفەرا خەرجیان لێ ئەبڕێو ناتوانن بۆ جێگای خۆیان بگەڕێنەوە، ئەو ماڵە بەش ئەکرێت، بەشی دەوڵەمەندەکانی تێدانیە، تا ماڵ هەر بەدەستی ئەوانەوە نەبێتو دەلولەتیان پتر بێتو هەژارانیش هەر لە هەژاریا بمێننەوە.

ئنجا کە جەنابی عومەر ئەم ئایەتەی خستە بەرچاویان بە .هەڵە چونی خۆیانیان بۆ دەرکەوتو زانیان رای خەلیفـــە تەواوەو بە هەموو دڵێکەوە پێی قایل بوون.

جەنابی عومەر خوا پلەی لە بەهەشـــت بەرزی کاتەوە ئەیزانی ئەو رایەی لەسەریەتی ڕاستو تەواوە بۆیە لەسەری ڕشت بوو بەڵام ئەیزانی نابێت بەپێی پلەی سەرۆکایەتی خۆی ڕایەکەی بەرێتە ســـــەرو ئەوانە بێدەنگ بکات، ئەبێت لەگەڵیان بکەوێتە موناقەشە تا بە بەڵگەیێك رایەکەی پێیان بسەلمێنێ.

سەرۆکی وڵات ئەبێت بزانێت کەی ئەبێت سەرتو توند بێت وەك پۆڵا ئەزانێت چەمانەوە چیەو بەرامبەر هەموو گێژاوێکی سەخت خۆی بگرێت کۆڵ نەدات، هەروەها بزانێت لە چ ڕووداوێك ئەبێت نەرمو شل بێت وەك نەمام چۆن پێویست بێت لار بێتەوە.

ئنجا سەرۆك ئەگەر شێوەی سەرۆکایەتیو بەرێوەبردنی وڵاتی بەو رەنگە بێت کە باسمانکرد ئایە لەگەڵ ئافرەتایەتی ئافرەت ئەگونجێت؟ لە کاتێکدا ئەو مانگی جارێك حەیزی پیا دێت بـاری دەرونـی تێـك ئەچـێت کـە بـە منداڵیش زگی پر ئەبێت تا منالی ئەبێت نارەحەتی روو ئەکاتـە لەشـیو بیرو تێفکریی کە ئەمە لەگەڵ وڵات بەرێوەبردنا ناگونجێت.

ئەمە لەلایەك لە لایەکی دیکەوە چۆن ئەشێتو ئەلوێت بە زکـــی پریەوە بەشدار بێت لەو کۆبونەوانەی کە سەرۆك ئەبێـــــــــت لەگەڵ کاربەدەستەکانی خوار خۆی بیبەستیو سەرۆکایەتی بکاتو لەگەڵیان بکەوێتە موناقەشەو رادەرخستنو راوەرگرتن، هەروەکو ئەبێت لەکاتی داگیرسانی شەڕ لەگەڵ دوژمن بە وزگەیەوە لەگەڵ ئەفسەرەکانا ناوە ناوە

کۆببێتەوە بزانێت پیلانی شەڕیان چۆنەو رای خۆی پێیان بگەیەنێ، جگە لەوەی ئەبێت بەپیـــــای ســـەرۆکی ئەو وڵاتانە بچێت کە ڕوو ئەکەنە وڵاتەکەی‌و پێشوازیان بکات‌و لەگەڵیان کۆببێتەوەو پەیمانیان لەگەڵ ببەستێت، جگە لەوەش کە ئەبێت بەدیتنی ئەو سەفیرانە هەڵبستێت‌و لەگەڵیان بوەستێت کاغەزی سەفیرایەتیان لێوەربگرێت کە وڵاتەکانیان لە وڵاتەکەیا بۆ بالوێزخانەکانیان ئەیانێرن.

ئەمە جگە لەوەی کە ئافرەت عاتفیەو دڵ نەرمو ناســـکە، عەتف‌و دڵنەرمی‌و ناسکی رێك ناکەوێت لەگەڵ بڕیاردان بە توندی لەسەرکاری قورس‌و گرنگ کە زۆرجار بەرژەوەندی وڵات پێوستی پێ ئەبێت.

لەبەر ئەمە ئافرەت نابێت خۆی لەم بوارە بدات‌و ڕوبکاتە ئەم رێیە سەختەی پڕ لە دڕك‌و داڵە کە بڕینی لە توانای ئەودا نیە.

بەڵێ ئەتوانێت بەپێی ئەو خوێندەواریەی هەیـــــەتی وەزارەتێك بەڕێوەبەرێت کە سنورەکەی تەسکە نەك وڵاتێك کە سنورێکی پـــان و پۆری هەیەو بەرژەوەندی وا ئەخوازێت کە ئافرەت ســـەرۆکایەتی وڵاتی بەدەستەوە نەبێت.

ئەوەی من بزانم بە درێژایی مێژوو وڵاتی مسوڵمانەکان ئافرەتێك نەبێت نەبۆتە سەرۆك، ئەویش (شجرة الدرّ)ە کە لە وڵاتی میسر دوای مردنی مێردەکەی سوڵتان نەجمەدین ئەییوب بە سەرۆك داندرا، بەڵام کە زانی ناتوانێت سەرۆکایەتی بەرێتە سەر سەرۆکایەتیەکەی دایە گەورەی ئەفسەرەکان عزەدین ئەبیك دوایی شووی پێکرد بەڵام پاشی ماوەیەك تاڵی کەوتە بەینیان، ئافرەتەکە بە فێڵێك لە حەمام ئەمی بە کوشتندا، دواکەوتوانی عزەدین کە ئەمەیان زانی، هێرشیان بردە ســەر (شـــجرة

الدرّ)و لە دوو دایانە دەست کوڕی عزەدین لە ژنێکی دیکەی کوڕەکەش دایە دەست دایکی کە بە کەنیزەکەکانی بەردەستی وت بە قابقاب لێدان تێی بەربن، ئنجا بەو شێوەیە ڕووی تێکرا تا گیانی لەدەست دا.

ئەشێت بوترێت پێش چەند ساڵێك ئافرەت لە پاکستان و لە ئەندەنوسیا لە بەنگلادێش ســـــەرۆکایەتی وڵاتیان کەوتە دەست، بەڵێ وایە، بەڵام سەرۆکایەتیان ئەو شێوە سەرۆکایەتیە بو کە ســـــەرۆکەکان لە وڵاتەکانی زۆربەی ڕۆژئاواییەکان هیچیان بە دەست نیەو هەر ناویان هەیە.

# چەند رەخنەیێکی دیکە

نوسەرێك لەوەی نوسیویەتی گەلێك رەخنەی لە ئایینی ئیسلام و پێغەمبەر گرتوە، ئەوانەی هیچ بەینێکیان لەگەڵ ئایین نەماوەو لە زانینی راستو تەواو بێبەشن، ئەوەی ئەو کابرایە نوسیویەتی ئەوان کاوێژی ئەکەن، وەکو ئەمانەی کەوا لێی ئەدوێم.

١- لە جێیێك لە کتێبەکەیا ئەڵێت ئایینی ئیسلام رێ ئەدات کچ بە منداڵی لەناو بێشکەیا لە یەکێك مارە بکرێت، بەبێ ئەوەی بزانێت ئەو مامۆستایانەی ئەو فتوایەیان داوە فتواکەیان لەسەر چی بەندەو لەسەر چی دامەزراوە، ئایا فتواکەیان بەڵگەیێکی لە قورئانی پیرۆز یان لە فەرمایشتێکی پێغەمبەر ﷺ لەسەر هەیە یان نا، هەروەها بەبێ ئەوەی بزانێت هەندێك لە مامۆستا بەرزەکانی پێشوی ئایین دروست نەبونی ئەو کارەیان دەرخستوە.

من ئەم باسەم لە کتێبەکەم (دارسات في العقيدة والتفسير والفقه) روون کردۆتەوەو دەرمخستوە ئەو مامۆستایانەی فتوایان بە دروست بونی ئەو مارەکردنە داوە فتواکەیان فتوایێکی ئیجتهادیە، دەلیلێکی نە لە قورئان نە لە فەرمایشتێکی پێغەمبەر لەسەر نیە، فتواکەیان دامەزراوە لەسەر عورفو عادەتێك کە لەوە پێشتر بڵاوبووە لەو کاتانەیا کە ئافرەت بێبەشبوە لە هەمو خوێندنو خوێندەوارێك. ئەو فتوایەی کە لەوە پێشتر دامەزرابو بێت لەسەر عورفو عادەتی کاتێك بە گۆڕانی کاتو عورفو عادەت فتواکە بە دروست نەبونی دێتە جێیو ئەبێت بە پێچەوانەی ئەو حوکم بدرێت.

ئەمە رای هەمو مامۆستایانی داناو زانای پێشوی ئایینە. ئەوەی ئەیەوێت پتر ئەم باسەی بۆ روون ببێتەوە با تەمەشای ئەم کتێبەم بکات ١- اعلام الموقعين ٢- فتاوى ابن تيميه ٣- زاد المعاد.

٢- لە جێیێکی کەیا لە کتێبەکەی ئەڵێت ئایینی ئیسلام رێ بە گۆڕانی بڕیاردانەکانی نادات کە لەگەڵ هەمو کاتێکا ناگونجێت.

کابرا ئەم قسەیەشی شایەدی نا تێگەیشتنێکی تریەتی. ئێمە ئەگەر تەمەشای بڕیاردانو رێکێشانی شەریعەتی ئیسلامی بکەین ئەبینین ئەو بەشەی پەیوەندی بە بەڕێوەبردنی کۆمەڵو وڵاتو دامەزراندنی دەوڵەتو هەڵسوڕاندنی کاروباریو رێك خستنی مامەڵەی مرۆڤان لەگەڵ یەکتریو لەگەڵ کۆمەڵو لەگەڵ دەوڵەت، ئەمانە کە بەشی زۆربەی شەریعەتی ئیسلامە هەموی بە پێی کاتو جێیکا گۆڕان هەڵئەگرێت و جیاوازی تێدا ڕووئەدات.

ئەمە کە ئەبێتە هۆی ئەوەی شەریعەتی ئیسلامی بۆ گشت ئادەمیزاد بێتو بۆ هەمو کاتێك بلوێتو دەست بدات چونکە شەریعەتێکە وشکیو تورتی تێدانیە، شەریعەتێکی نەرمە لە ناوخۆیا بە پێی جێگاو کات تازەوەبون و گۆڕان رووی تێئەکات.

قاعیدەێیكو بەندێك لە بەندەکانی ئەڵێت: (تتبدل الاحكام بتبدل الازمان) واتە بە پێی گۆڕانی کاتوجێگاو عورفو عادەت ئەحکامی فقهی گۆڕان رووی تێئەکاتو بە پێی پێویست ئەحکامی دیکەی دێتەجێ.

ئەگەر ئێمە تەمەشای بەشی زۆری رای مامۆستایانی مەزهەبەکان بکەین ئەبینین جیاوازیەکانیان دامەزراوە لەسەر گۆڕانی کاتو جێگا،

ئەم جیاوازیە هەروایە لە شورەی مەزهەبێکی تایبەتیشا. بۆیی ئەبینین هەندێك بڕیار کە جەنابی ئەبو حەنیفە بڕیاری لەســـەر داوە ئەبویوسف دوای ئەو بە پێچەوانەی بڕیاری ئەو بڕیاری لەسەرداوە، هەروەهاش محمدی کوڕی حەسەنی شەیبانیش کە ئەویش قوتابی ئەبوحەنیفە بوە.

بۆ دور بڕۆین ئیمامی شافیعی کە چۆتە میســـر لەوێ بە پێی عورفو عادەتی میسر گەلێك فتوای بە پێچـەوانەی ئەو فتوایانە داوەکە لە بەغدا داویەتی، ئەمە کە لە کتێبی شافعیەکان بە مەزهەبی تازەی ناو ئەبەن.

ئیبنولقەییم کە مامۆستاییکی زۆر بەرزو زانـا بوە ئەڵێت: ئەگەر موفتی پرسیاری چۆنی حوکمی کارێکی لێکـرا دەبێ بە پێی عورفو عادەتی ولاتی خاوەن پرسیارەکە وەلام بداتەوە، چونکـــە هەر ولاتێك بەرامبەر هەر کارێکی ژیان عورفو عادەتێکی تایبەتی خۆی هەیە، ئەبێت موفتی لەسەر ئەو ئەساسە حوکم بدات.

ئەحکامی شەریعەت کە گۆڕان ڕووی تێناکات ئەوانەن کە دەربارەی بڕواو عەقیدەو نوێژو ڕۆژوو زەکات دانو چونە حەجە لەگـەڵ چەند ئەحکامی کەمی دیکەی کە بەڵگەییکی لە قورئان یان لە فەرمایشتی پێغەمبەری لەسەرە، بە پێچەوانە هەمو بڕیاردانێکی دیکـەی کە بە ئیجتهاد ڕوودات.

٣- لە جێییکی کەیا ئەڵێت: مسوڵمانەکان لە کاتی خۆی کە شەڕیان لەگەڵ دانیشتوانی ولاتەکانی دیکە ئەکرد بە خورتی خەڵکـــیان مسوڵمان ئەکرد. ئەم وتارە کاوێژکردنی ئەو وتارەیە کە هـەندێك لە پیاوانی کەنیسەی دوژمنی ئایینی ئیسلامو موبەشیرەکانو هەندێك لە موستەشرقەکان وتویانە.

ئەو کابرایە ئەگەر شتێکی لە ئایینی ئیســـلام تێبگەیشتایە ئەم کاوێژەی نەئەکرد، چونکە خودا لە ئایەتی (٢٩) لە سورەتی (الکهف) ئەفەرموێت: ﴿فَمَن شَاء فَلْيُؤْمِن وَمَن شَاء فَلْيَكْفُر﴾، واتە: ئەوەی ئەیەوێت ببێتە مسوڵمان با بێت، ئەوەیش ئەیەوێت کافربێت کەیفی خۆیەتی‌و هیچ خورتیێك یان ناخۆشیێك روی تێناکات، جەزای ئیمانداری‌و بێ‌ئیمانی لە دوا رۆژا دێتەدی.

جگە لەمەش خودا لە سورەتی کافرون بە پێغەمبەر ئەفەرموێت: بە کافرەکانی مەککە بڵێت ﴿.... لکم دینکم ولی دین﴾، واتە: ئـەی کافرینە ئایینی خۆتان کە بت پەرستنە با بۆخۆتان بێت منیش دینی خۆم کە ئایینی ئیسلامە بۆ خۆمە، لە لایەن رووکردنە ئاین خورتی لە کەس ناکرێت. ئەمە لە لایێك لە لایێکی دیکەوە ئەگـــــەر بۆ مسوڵمان بوون خورتی ببوایە، دەبو لەو وڵاتانەی ڕوناکـــی ئایینی ئیســـلامی گەیشتیێ غەیرە دینێکی تێدا نەبوایە.

ئێستاکە هەر لەناو کوردەواریا دانیشتوانی هەندێك دێهات لەسەر ئەو ئایینەن کە لەوە پێش باوکیان‌و باپیرانیان لەسەری بوون وەکو دێی (هەرمۆتە)ی نزیك شاری کۆیێ کە هەمو دانیشتوانەکانی دیانن. ئەگەر ئایینی ئیسلام بۆ مسوڵمان بون خورتی تێدا ببوایە ئەبو ئەم دێیە دیانی تێدا نەبوایە. هەروەها دێی (دینارتە) کە لە دەشتایێکا دوای ئەو چیایەی بە پشت شاری عەقرەوەیە، گەلێك دێی تریش کە لە دەوروپشتی شاری موصلە کە دانیشتوەکانیان هەمو دیانن، جگە لە ناحیەی عەنکاوە کە نزیکی شاری هەولێرە.

بۆ دور بڕۆین جولەکەکان لە عێراق پێش ئەوەی بە کۆمـــەڵی بۆ فەڵەستین کۆچ بکەن لە هەمو شارەکانی بەشێکی زۆری لەو جولەکانە

تێدابوو گەرەکی تایبەتیان هەبو. ئنجا ئەگەر رێی ببوایە کەسێك بە خورتی بکرێت بە مســـولمان ئەبوایە دیانو جولەکە لەو جێگایانە بونیان نەبوایە.

٤- لە جێیکی کە ئەڵێت شەریعەتی ئیسلامی فتوا بە کەوتنی تەلاقی سەرخۆش ئەدات، ئنجا رەخنەی خۆی لەم روەوە دەر ئەخات.

ئەم رەخنەیەشی وەکو رەخنەکانی دیکەی پوچەڵە، چونکە ئەگەر ئەو لە کتێبێکی شافعیەکان قسەیێکی وای دیبێ نابێت وای بزانیایە ئەوەیە رێکێشانی شەریعەتی ئیسلام بەبێ ئەوەی بزانێت مامۆستایانی تری پێشو چیان وتوە.

یەکێك ئەگەر عەرەق بخواتەوە بەبێ ئەوەی بزانێت ئەوە عەرەقە، دوایی سەرخۆش بێتو ژنەکـــەی تەلاق بدات هەمو مامۆستایانی مەزهەبەکان ئەڵێن تەلاقەکەی ناکەوێت. بەلام ئەگەر مرۆڤێك بە ئارەزوی خۆی عارەق بخواتەوەو سەر خۆش بێتو ژنەکەی تەلاق بدات بەشێك لە مامۆســتایانی مەزهــەبەکان فتوایـــان بە کەوتنی تەلاقەکەیان داوەو وتویانە ئەمە ئەبێت سزای عەرق خواردنەوەکەی بێت. حەدیسێکیانیش لەسەر رایەکەیان کردوە بە بەڵگە.

بەلان بەرامبەری ئەمان بەشێکی دیکەی داناو زانا لە مەزهەبەکان ئەو رایەیـــان رەدکردۆتەوەو وتویانە ئەو تەلاقە ناکەوێت، وەکو مامۆستای دانا تەحاویو کـــەرخی لە مەزهەبی حەنەفی، موزەنیو سەوری لە مەزهەبی شافعی، کە ئەمە راییکی ئیمامی شافعیەو رای ئیمام ئەحمەدەو رای خەلیفەی سێیەم جەنابی عوسمانەو رای خەلیفەی دادپەروەر عومەری کوری عبدولعەزیزەو رای ئیمام طاوس و ئەبوسەورو

ربیعـــەو ئیبن حەزمو ئیبن تەیمییەو ئیبنو قەقیمەو بەشـــێکی تر لە مامۆستا بەرزەکان.

ئیبنو قەییم کە مامۆستایێکی بەرزو دانایە لە فەرمایشتەکانی پێغەمبەر ﷺ ئەو حەدیسەی خاوەنی ڕای یەکەم کردویانە بە بەڵگە لەسەر رایەکەیان ئەم، ڕەددی ئەکاتەوەو ئەڵێت: ئەوە فەرمایشـــتی پێغەمبەر نیە.

ئەم مامۆستایانەی بەشی دووەم هەمو ئەڵێن: تەڵاقی سەرخۆش ناکەوێت چونکە سەرخۆش خاوەنی ویسـت نیە، ئەوەی بەسەر زوبانیا دێت، نازانێت چیەو چی ئەڵێت وەکو شتێك وایە هەروەها ئەڵێن: نابێت بوترێت بڕیاردان بە کەوتنی تەڵاقی سەرخۆش ســــزا بۆ خواردنەوەی عەرەق بێت، چونکە خواردنەوەی عەرەق لە شــەریعەتا سزای تایبەتی خۆی هەیە، سزاش نابێت ببێتە دو سزا.

هەروەها ئەڵێن گوناهی ژنەکەی چیە تا بە خەراپی مێردەکەی سزا بدرێت و تەڵاقی بکەوێت ژیانی لـێ تێك بچێت.

ئەوەی ئەیەوێت بۆ زیادە رونبونەوەی باسەکە با تەمـەشای باسی (طلاق الاغلاق) بکات لە کتێبی (زاد المعاد) کە هی ئیبنو لقەییمە، هەروەها تەماشای باسی (طلاق السكران) بکات لە کتێبی (المحلّى) کە هی ئیبن حەزمی ئەندەلوسیە.

٥- لە لاپەڕێیکی دیکەدا ئەڵێت: ئافرەت بە پێی شەریعەتی ئیسلامی لە مارەکردنیا هیچ ڕائیکی بە دەست نیە، را هەر بە دەست کەسو کاریەتی.

ئەم قسەیە ئەگەر شتێك لە ڕاستی تێدابێت بە نیسبەت عەشایەری عەرەبەکانو کوردەواری قســەییکی درۆی ئاشکرایە بە نیســـبەت

شەریعەتی ئیسلامی‌و دورە لە ڕاو بڕیاردانی مامۆستایانی زاناو داناى پێشوى مەزهەبەکان. ئەوانە رایان وایە کە هیچ کەسێکی ئافرەت ئەگەر چی باوکیشی بێت ناتوانێت بەبێ رێدانی ئەو لە یەکێکی مارە بکات، چونکە پێغەمبەر ﷺ ئەم هەقەی بۆ بڕیارداوە بە فەرمایشتێ کە فەرمویەتی (الأيّم أحق بنفسها من وليها، واذنها صماتها) ، واتە: ئافرەتی بێمێردی بێوەژن هیچ کەسێکی ناتوانێت لە یەکێکی مارە بکات تا خۆی ڕێنەدات‌و ڕازی نەبێت، کچیش ئەبێت ڕای وەربگیرێت، ئنجا ئەگەر وسکت و بێدەنگ بو ئەوە وا ئەگەیێنێ ڕازیەو پێی خۆشە.

ئیبن المنذر ئەڵێت: ئەگەر کچە لە کاتی ڕاوەرگرتنی بێدەنگ‌و وسکت بو، دوای ئەوەی مارە ئەکرێت بڵێت من رازی نیم‌و نەم ئەزانی وسکت بونم ڕەزامەندیم ئەگەیێنێ، ئەو مارە کردنە هەڵئەوەشێت.

ئیبن عەبباس ئەڵێت: کچێك هاتە لای پێغەمبەر وتی باوکم منی لە یەکێك مارە کردوە کە من نامەوێت، پێغەمبەر پێی فەرمو سەر بەستی، ئەگەر ناتەوێت مارەکردنەکەت جێ خۆی ناگرێت‌و هەڵئەوەشێت، کچە وتی: مادام باوکم مارەی کردووم رازیم، هەر ویستم باوکان بزانن هەقی ئەوەیان نیە کچی خۆیان بەبێ ڕازی بونی لە یەکێك مارە بکەن.

بۆ دور بڕۆین حەنەفیەکان کە ئیمامی ئەبوحەنیفە سەرۆکیانە لایان وایە ئافرەت چ بێوەژن بێت یان کچ ئەتوانێت خۆی لەو کەسەی ئەیەوێت مارە بکات ئەگەر خاوەنی بیرو هۆش بو گەیشتیبوە ڕاددەی بلوغ، ئنجا کەسوکاری هەر چەندێك باوکیشی بێت بەو مارەکردنە قایل نەبن.

ئێستاکە مەحکەمە شەرعیەکان وەکو بزانم لە وڵاتە عەرەبییەکان لەسەر ئەم رایە ئەڕۆن.

٦- لە لاپەڕێیکی تر ئەڵێت: پێغەمبەر عائیشەی کچی ئەبوبەکری مارە کرد بەبێ ئەوەی رای وەربگرێت. کابرا ئەم قسەیەی بە ڕەخنەیەك ئەخاتە بەرچاو. ئەم قسەیەشی قسەیەکی لارو پوچەڵە وەکو قسەکانی تر ئەمە قسەیەکە هیچ هەمبانەیەك ناگرێتە خۆی، چونکە ئەو ڕا وەرگرتنە بۆ باوکیەتی نەك بۆ پێغەمبەرە.

پێغەمبەر ﷺ داخوازی عائیشەی لە باوکی کرد کە جەنابی ئەبوبەکرە، ئەبوبەکریش بێگومان بە هەمو شادیی‌و خۆشیەکەوە ئەم خۆشیەی بە کچەکەی گەیاندو شادی پێبەخشی. ئنجا ئایا کێ هەبوە لە خۆشیا ئەگەر بۆی بکرایە باڵنەگرێت ئەگەر بیزانیایە پێغەمبەر داوای دەکات‌و بە هاوسەری خۆی ئەگیرێ‌و ئەو شەرەفەری پێئەبەخشی‌و ئەیکات بە دایکێك لە دایکەکانی مسوڵمانان‌و باوکیشی بە خەزوری خۆی دائەنێت. بەڵام ئەو چاوە کول بێت سپی بە ڕەش ئەزانێت مێشکی خاوەنەکەی لە تێگەیشتن بێبەش ئەکات.

٧- لە جێیکی کەیا ئەڵێت: ئافرەتێك چوە لای پێغەمبەر ﷺ داوای کرد مارەی بکات، پێغەمبەریش بەبێ ڕا وەرگرتنی لە یەکێکی مارە کرد، ئنجا ئەڵێت چۆن دروستە یەکێك ژنێك بەبێ ئیزن لێوەرگرتنی لە یەکێك مارە بکات. ئەم ڕەخنەیەش شایەدە لەسەر نەزانین‌و کاڵ فامی. ئەو ڕوداوە بەم شێوەیە بوە، پێغەمبەر ﷺ کە لەگەڵ بەشێك لە یارەکانی دانیشتبو ئافرەتێك هات وای دەرخست کە ئەیەوێت پێغەمبەر ﷺ مارەی بکات، ڕوداوەکە وا دەرئەخات کە ئافرەتەکە

بێ‌کەس و بەبێ گوزەران بوە، هاتۆتە لای پێغەمبەر بۆ ئەوەی بیکات بە خاوەن مێردو لە بێکەسی‌و ئیدارە خراپی رزگاری بکات، ئنجا پێغەمبەر کە خۆی نەیویســـت مارەی بکات ویســـتویەتی یەکێك لەوانەی لەگەڵی بون حەز لە مارەکردنی بکاتو ئاواتی ئافرەتـــــە بێنێتە دی، فەرمویە کێ ئەیەوێت ئەم ئافرەتە بکاتە هاوســـەری خۆی، یەکێك لەو دانیشتوانە وتویەتی من، پێی وتوە چیـــت هەیە بیکـــــەی بە مارەیی، وتویەتی هیچم نیە لەو کراسە زیاتر کەوا لەبەرمایە، پێی فەرموە بچۆرەوە ماڵەوە بزانە چیت دەست ئەکەوێت هەر چەندێك کەم بێت، پیاوە بە گورجی ڕوی کردۆتە ماڵەکەی بەلام بە دەست بەتاڵی گەڕاوەتەوە هیچ شـتێکی دەست نەکەوتبوو.

ئنجا پێغەمبەر ﷺ پێی ئەڵێت چیت لە قورئان لەبەرە، ئەویش ئەوەی لەبەریی بوە دەری خستوە، پێغەمبەر فەرمویەتی: ئەوەی لەبەرتە فێری ئەم ئافرەتەی بکە تا ببێتە مارەیی بۆی. ئنجا لەسەر ئەم مەرجە ئافرەتەکەی بە کەیف خۆشی‌و ڕەزامەندیەوە لە پیاوەکەی مارەکردو لەو ناخۆشی‌و بێکەسی‌و تەنیاییە رزگاری کردوە. ئنجا ئایە ئەم جێی ڕەخنەیە، یان دەرکەوتنی دوربینی‌و حیکمەتی پێغەمبەرەی تێدایە، سلاوی خوادی لەسەر بێت.

٨- ئەم لە ئایین وەرگەڕاوە لە جێیەکی دیکەدا لە کتێبەکەیا ئەڵێت: پێغەمبەر بەو چاوەی تەماشـــــای شەیتان ئەکات، بە هەمان چاو تەماشای ئافرەت دەکات.

مرۆڤ ئەگەر بوغزو کینەی بەرامبەر یەکێك زۆر تیژو بەتین بێت لە سنوری بیرو هۆش ئەچێتە دەرەوەو درۆو ئیفترای وا ئەکات کە یەکێك نەختێك تێگەیشتنی هەبێت بڕوای پێ ناکاتو کابرای لەبەرچاو ئەکەوێت.

پێغەمبەر ﷺ هەروەکو لە باســێکی لەمەوپێش باســمان کرد کە فەرموویەتی: چاکترین کەستان ئەو کەسەیە کە بۆ خێزانەکەی باش بێتو بفەرموێت: من باشـــترینتانم لە باشیا لەگەڵ خێزانەکانم، هەروەها لە دامێن کێوی عەرەفە بە وتارو پەندێك رو بکاتە یارەکانیو بە ئامۆژگاری پێیان بڵێت: ئافرەتەکانتان ئەمانەتی خودان لای ئێوە ئەبێت بەو چاوە تەمەشایان بکەن هەر وەکو ئێوە هەقتان بەسەر ئەوانەوە هەیە، ئەوانیش هەقیان بەسەر ئێوەوە هەیە.

هەروەها لە فەرمایشتێکی دیکەیا بڵێت: هیچ کەسێك ئافرەت بە چاوێکی نزمو بێنرخ تەمەشا ناکات تەنیا کەسانی بێکەڵكو کینە دار نەبێت، کەسیش قەدریان ناگرێت کەسانی رەسەنو بە حورمەت نەبێت: لە فەرمایشتێکی دیکەیا کە بفەرموێت هەروەکو لەمەوپێش زانیمان- بەهەشت لەژێر پێی دایکانە -کە ئافرەتن.

پێغەمبەر ﷺ کە خاوەنی ئەم فەرمایشتانە بێت چۆن بیرو هۆش ڕێ ئەدات کە بە چاوێکی کەم تەماشـــای ئافرەتی کردبێتو بوترێت بەو شێوەیەی تەماشـــای شـــەیتانی کردوە ئەوها تەماشای ئەوانی کردوە، ئەمە قسەیێکە لە دڵێکی بۆگەنی گڵاو نەبێت نایەتە دەرەوە، ئنجا یەکێك کە لە دیتنی ڕۆشنایی کوێر بێتو ڕۆشـــــنایی رۆژ بە تاریکی شەو بزانێت ئەبێت وتاری چ نرخو سەنگێکی هەبێتو ئایە لە تەنەکەی زبڵ زیاتر جێگیر ئەبێت؟

٩- ئەم لە خودا یاخیە لە لاپەڕێکی دیکەی کتێبەکەیا لە مانـــــای ئایەتی (١٤) لە سورەتی (آل عمران) کە خـــودا ئەفەرموێت: ﴿زُيِّنَ لِلنَّاسِ حُبُّ الشَّهَوَاتِ مِنَ النِّسَاء وَالْبَنِينَ وَالْقَنَاطِيرِ الْمُقَنطَرَةِ مِنَ الذَّهَبِ وَالْفِضَّةِ وَالْخَيْلِ الْمُسَوَّمَةِ وَالأَنْعَامِ وَالْحَرْثِ ذَلِكَ مَتَاعُ الْحَيَاةِ الدُّنْيَا وَاللهُ عِندَهُ حُسْنُ الْمَآبِ﴾ بەبێ شـــــەرمو حەیا ئەڵێت ئەم ئایەتە بە چ چاوێك تەمەشای ئاژەڵ ئەکات هەر بەو شێوەیە تەماشـــــای ئافرەت دەکات. ئەم کابرایە لە دوا ڕۆژا بە چ ڕەنگ زەردێك لە حوزوری خودا بوەستێت کە مانای فەرمایشـــتەکەی بەم شێوەیە خستۆتە بەر چاو تا ئەوانەی تێناگەنو ئیمان لەناو دڵیانە کزە مانـــــای ئایەتەکە بە خراپی وەربگرنو لە ئاییـن وەربگەڕێن.

خودا لەم ئایەتەدا ئەفەرموێت: خۆشیو ئارەزوی ژیانی دنیامان بـۆ ئادەمیزاد ڕازاندۆتەوە، لە خۆشویستنی مرۆڤان بۆ ئافرەتان، ئافرەتانیش بۆ مرۆڤان، هەروەها خۆشویستنیماڵو منداڵو سامانی زۆر لـە زێـڕو لە زیو لە ئەسپی ڕەسەنی دیمەن جوان کە بەرئەدرێ تا لـەناو شـینایـیا بلەوەڕێت، هەروەها خۆشویستنی ئاژەڵ لە مەڕو بزنو حوشـترو مانگـاو کێڵانی باغ و باغاتو دەغڵو دان.

ئەمانەمان لەم دونیایە ڕازاندۆتەوە خۆشەویستمان کردوە کـە تیـا بەخۆشی مایەی ڕابواردنە. بەڵام ئادەمیزاد لەم دونیایـەیا نابێـت دڵـی هەر بەمانەوە بەند بێتو هەر بۆ ئەمانە هـەوڵ بـداتو دوارۆژی لـەبیر بچێتو هەوڵی بۆ نەدات، بەڵکو ئەبێت بە باشـی هـەوڵ بـۆ ئـەمیش بداتو خۆی لە خودا نزیـك بکاتـەوە بـە بـەجێهێنانی فەرمانـەکانیو ڕوکردنە چاکەو خۆ لە خەراپە پاراستن، خودا باشترین دواهـاتنی لایـە،

دایناوە بۆ ئەوانەی خۆشی ژیانی دونیا لە هەوڵدان بۆ خۆشی دوارۆژ دوایان ناخات.

قانونی خودا لە ژیانا ئەبێت بەم شێوەیە بێت، هەوڵدانی بۆ هەردوو ژیان تێدابێت تا بەشدار بێت لە خۆشی هەردوو لایان، نەك پشت بکاتە دوارۆژو مەبەستی هەر خۆشی دونیا بێتو هەر بۆ ئەم هەوڵ بدات.

هەروەهاش نابێت پشت بکاتە دنیاو لە ژیانێکی ناخۆشدا بژێت، وەکو هەندێك لە روهبانەکان کە خۆیان هەر بۆ خوداپەرستن تەرخان کردوە، هەروەها وەکو ئەو هیندیانەی کە بە فەقیر ناوئەبردرێنو دنیایان لەبەرچاو تاریکەو خۆیان لە هەمو خۆشییەکی تیا بێبەش کردوە.

خودا ئەمانەی ڕازاندۆتەوەو خۆشی کردوە، چونکە بە یەك گرتنی مرۆڤان لەگەڵ ئافرەتان بە حەلاڵیو خێزانداریو نەوەو نەتەوە دێتە دیو کۆمەلایەتی ڕوئەدات، کارەکانی دیکەشی ڕازاندۆتەوەو خۆشکردوە تا هەمو کەسێك لە ژیانیا رو بکاتە کۆششو کاسبیو ماڵو سامان دەست خستن کە ئەبێتە مایەی شارستانیەتی کۆمەڵگاو وڵات پێش کەوتن.

ئایەتەکە ئەم مەبەستانەمان پێئەگەیێنێ نەك ئەوەی ئەو لە خودا یاخیە ویستویەتی بیخاتە بەرچاو.

# پێرست